# کورتەیەک
# لە
# ڕێزمانی کوردی



کردوکۆ لێکۆڵینەوەی

صالح حسین حسن لشدری

چاپخانەی بەغدا - بەغدا

# کورتەیەک
# لە
# ڕێزمانی کوردی

کردو کۆ و لێکۆڵینەوەیێ

صالح حسین حسن لشدری

چاپخانەی بەغدا ـ بەغدا

## پێش‌کەش کردن :

ئـەم نامیلکەی لەبەردەست دایـە ، بەرەنجـامی بەیـدەری چوارپێنج دەستنوسی ترە ، کە لە ماوەی سێ‌چوار سـالێکی لەمـەوپێش خـۆم پێـوە خەریك‌کردوون‌و بەرەبەرە شەن‌وکەوم کردوون ، تا وەك مشتاخێکی پاك ئەو نامیلکە لەو دایکانەوە هاتۆتە دنیـاوەو چلۆچێـوی لەسـەر خـۆی لاداوە ٠ نامیلکەکە بریتی‌یە لەشەش زووری دەرگادار :

دەرگەی‌یەکەم ــ بێژەی پیتی ٠

دەرگەی‌دووەم ــ ووشەی ناوی ٠

دەرگەی سێیەم ــ ووشەی فرمانی ٠

دەرگەی‌چووارەم ــ ووشەی ڕاناوی ٠

دەرگەی‌پێنجەم ــ ووشەی ئامرازی ٠

بەشی‌شەشەم‌و کۆتایی ــ ڕستەو چەشنەکانی ٠

بەلام بێژەی پیتی کەگیرەك ــ پیشگروپاشگر ــ و نیشانەکان دەگرێتەوە ، سەربەخۆ باس نەکراون ، چونکە سەربەخۆ نین‌و ئەچنە یا ئەلکێنە ووشەی نـاوی‌و ووشـەی فرمـانی ، لـەوێ لەشـوێنی خویاندا دەرخـراون ٠ ئێـدی ئەمە نامیلکەکەیەو هەر شەش دەروازەکانی لەسەرپشتە ، بەووردی‌و سەرنـج‌و بـەراووردەوە بیخوێنـەوە ، تابنـەرەتی ووشـەکانی زمانت وەك مێژی‌قنچك‌کراوو شێوەی ڕستـەکانی ڕاوێژت لەسـەر ڕەوتی ڕەوانی زمانەکە لەچەند پەرەیێك‌دا بخـاتە ئامێزەوە ٠٠٠ ئـەم‌نامیلکە بـەشی‌زۆری لەلایەن کەلەنووسەرێکی ڕێزمانیەوە هەلسەنگێنراوە ، بـەپێویست زانـرا بخرێتە ناوەوە ٠

دانـەر

## لێ ورد بوونەوە

بۆم دەرکەوت ، مامۆستا صالح حسین لەگەڵ کاروانی زمانەوانیدا هۆگر بووەو بەپەروشەوە گەرەکیەتی ــ لەومەیدانەدا ــ جێدەستی دیاربێ ۰

لەم کتێبەی وردبوومەوە کە بەسەر ناوی ( کورتەیەك لەرێزمانی کوردی ) یەوەیە ۰ رەخنەکارانە قەڵەمی لێ ڕانادەم ۰۰ تەنیا ــ خۆی گوتەتەنی ــ کۆکردنەوەو ریك‌خستنی کەرەسە گرنگەکانی رێزمانی کوردیە ؛ ناچێتە ریزی لێکۆڵینەوەیەکی بەراودکاری ی ڕوتەوە ۰۰ لەوەش بەدەرە وەك کتێبێکی ساکاری بەرنامەی فێرکردن ، ئانویۆیەکی تایبەتی بەبالآی خۆی ببڕێ ۰

بەلای منەوە گردوکۆیەکەو کەرەسەیەکی باشی بۆ رەنێو هێناوە ۰۰ بەچاوپۆشین لەچۆنێتی ی ریك‌خستن‌و دابەزاندن‌و ئالو گۆڕی هەندێ زاراوەی تایبەتی ، لەزۆرلاوە جێدەستی زیرەکانەی پێوە دیارە ۰۰ تائەندازەیەکیش پێزی داوە بەرستەی ئاوێتەو نموونەی جوانی بۆ شی‌کردونەتەوەو کەرەسەیەکی فرەشی نێواخن کردوە ۰

دەشێ ددان بەوە دابنێین کە هێمان رێزمانەکەمان لەقۆناغێکی ناثارام دایە ۰ چۆن دەوروخولی ئەم نامیلکەیە بدەین ؟! سەرەتای کارێکی پیرۆزە ۰۰ ئەوکارە پیرۆزەیە کەنوسەرە ئازیزەکانمان کەمتر قەرەی دەکەون ؛ جێی خۆیەتی ئەم‌بەرهەمەش ــ وەك یەکەم تاقی‌کردنەوەی نووسەر ــ چاو هەڵبهێنێ‌و ببێتە نواڵەیەك لەسەر خەرمانی رێزمانەکەمان‌و بۆکردوکۆشی یەکبیتەمان‌سودی لێ وەربگیرێ ۰۰۰

بەگشتی بۆم‌هەیە کەبڵێم : لەوجۆرە بەرهەمانەیە کەلایەنی هەمواریان سلاو دەداتەوە شیانی داڵدەگرتنن ۰ ئومیدەوارم کەببێتە خوانی زمان‌دۆستان‌و ئەوسا بەکەیفی خۆیان‌و بەوێژدانێکی ئاوەدانەوە لێکی هەڵبهاوێژن‌و لێی هەڵبهێنجن ۰۰

رەئووفی ئەحمەد ئالانی
١٩٨٤/٦/٢٣

دەرگای یەکەم ـ بێژەی پیتی :

بەر بەشە کانی پیت ئەمانەن :

١ ـ گیرەك : پێشگرو پاشگرەکان ·

٢ ـ نیشانە ، وەك :

( ی ، ێ ، ەك ، ێك ، ان ، ات ، ەها ، ینە ، ئە ، دە ، ب ، نە ، نا ، مە ، را ، ڕێ ، ەر ، ێن ، ینەر ، او ، راو ، ێنراو ·· )

ئەمانە هەموویان هەریەکە لەشوێنی خۆیدا دێت ·

دەرگای دووەم ـ ووشەی ناوی :

بەربەشەکانی ووشەی ناوی ئەمانەن :

١ ـ ناو :

ناو ووشەیێکە کرابێتە ناو بۆ :ـ مروف ، گیاندار ، رووەك ، بێ گیان ، چمکێك ( واتایێك ) ، سادە بێ ، دارژاو بێ داتاشراو بێ ، یان لێکدراو ··

٢ ـ ئاولناو ( سیفەت ) :

ئاولناو ، ووشەیێکە شێوەو سیفەتی شتێك بگەیێنی وەك : ڕاست ، درۆ ، ترش ، شیرین ، زبر ، لووس ·

ئاولناو سێ جۆرە :

آ ـ ئاولناوی ڕەبەق ( رووت ) : وەك نموونەکانی پێشوو ·

ب ـ ئاولناوی سەربەخۆ :

سادە بێ ، وەك : دز ، توورە ، شێت ، گەنج ، تێر ، برسی ، رژد ·· یا دارژاو وەك : زەردینە ، پانکە ، لووسەك ، ترشۆك ، یا داتاشراو ، وەك :

جوتیار ، کرێکار ، دەولەمەند ، سەعاتچی ، دارەوان ، هۆشیار ، ورگن ، ئاسنگەر ·· نەزان ، ناساغ ، بێچارە ، بەهێز ···

یا لێکدراو ، وەك : چاوساغ · دەنگخۆش · هاوڕێ · خالۆژن · شورەسووار ··

چ ، د ـ ئاوەڵناوی ڕاستەوخۆ و بەیاریدە : ئەم دووانە سەربەخۆ باس دەکرێن :

٣ ـ جێکات ، ( ئاوەڵفرمان ) :

وشەیێکە لایێك یان کاتێك بگەیێنێ ، وەکو : کن ، پاش ·· ئێوارە ·

٤ ـ ڕەگەز : قەد یا ڕەگی چاوگ ···

٥ ـ ژمارە : وشەیێکە ژمێرانەو پێوانەو کێشانە دیاری بکات · ئەم پێنج جۆرەووشانە ، یاسادەن ، یادارژاو ، یاداتاشراو یاخود لێکدراو ، وەکو بەدوایەکدا باس دەکرین بەنموونە جۆری یەکەم ـ ووشەناوی سادە :

ووشەناوی سادە ئەووشە ناویانە دەگرێتەوە کە هیچ گیرەکێکی دارێژو داتاشیان پێوە نەبێ ، نە لەپێشەو نە لەپاشیانەوە ، وەکو لەم خشتەی ژێرەوەدا پێشان دراوون ( بەڵام پیت و ئامرازی سادەش بەر کەوتوون ) ·

## خشتەی ووشە نـاوی سـادە

| کێش | نموونە |
| --- | --- |
| ق | ئـ ، چ ، ژ ، ل ، د ، ب : ئەمانە بەتاکی لەزاری سەروودا هەن ، |
| قە | ئـە ، بە ، تە ، حە ، دە ، سە ، کە ، گە ، لە ، مە ، نە ... |
| قـا | ئا ، با ، تا ، جا ، چا ، پـا ، حا ، دا ، را ، سا ، شا ، کا ، گا ، لا ، ما ، وا ، نا .. |
| قوو | تو ، جو ، حو ، خو ، دو ، رو ، زو ، شو ، فو ، کو ، گو ، لو ، مو .. |
| قۆ | بۆ ، تۆ ، جۆ ، خۆ ، دۆ ، رۆ ، سۆ ، کۆ ، گۆ ، نۆ ، لۆ ، هۆ .. |
| قی | بـی ، چـی ، زی ، سی ، کی ، نی ، هی ، وی .... |
| قێ | ئـێ ، بـێ ، پـێ ، تـێ ، جێ ، چێ ، حێ ، خێ ، دێ ، رێ ، زێ ، سێ ، شێ ، کێ ... |
| قف | تف ، دل ، گل ، رق ، بن ، مـز ، دز ، بف ، کن ، کچ ، ژم ، ژن .. |
| قەف | رەک ، کەس ، بەز ، رەپ ، ئەن ، گەل ، سەر ، نەم ، لەت .. |
| قاف | دار ، کار ، سال ، قاش ، راو ، چاک ، پان ، داس ، ژار ، بال ، |
| قوف | کون ، گول ، بوت ، کوچ ، قوڕ ، گون ، کول ، کوڕ ، کوت .. |
| قووف | لـووس ، دوور ، قـوول ، پـووش ، بـووک ، توور ، پوور ، روون ، |
| قۆف | ئـۆخ ، هـۆش ، چـۆن ، دۆل ، خۆش ، بۆن ، نۆک ، مۆز ، بـۆق ، |

| کێش | نموونە |
| --- | --- |
| قیف | ریز . تیژ . تین . لیك . فیز . ژیر . كیژ . هین . سیم . زیخ . |
| قێف | فێل . خێو . لێو . رێز . كێو . مێش . هێز . شێر . وێل .. |
| قفل | فلق . چلك . بزر . كرم . بزن . كرژ . گرد . شتل . خزم . سكل . |
| قفال | گران . زمان . بژار . كڵاو . دراو . سلاك . ددان . ژمار .. |
| قفوول | چرووك . بلووس . سروود ... بلۆق . دلۆپ . خرۆش .. |
| قفۆل | چنۆك . سمۆر . پنۆك . گرۆپ . پلۆخ .. |
| قفیل | بریس . گزیر . برین . چلیت . شریت . سمێل . نقێم . |
| قفێل | ردێن . چلێس . سرێش . ركێف . كرێژ . نشێو . |
| قەفل | بەرد . گەنم . كەوش . چەرم . مەرگ . گەرد . دەغل . خەڵك . |
| قەفەل | هەرەد . گەرەك . لەوەڕ . مەرەز . مەرەد . قەرەج . گەرەك . |
| قەفال | دەوار . هەزار . بەراز . تەواو . كەوان . لەغاو . جەناب . بەران . بەهار . جەوال . دەمار . شەقام . |
| قەفوول | خەڵروز . خەزوور . چەمووش . زەبوون . تەنوور . دەمووس . |
| قەفۆل | پەرۆش . هەرۆل . ئەتۆم ! كەپۆر . سەهۆل .. |
| قەفیل | كەویژ . پەنیر . پەسیو . هەویر . فەریك . خەریك . بەزین . |
| قەفێل | كەتێر . هەوێن . بەلێن . كەلێن . كەنێر . شەوێل .. |
| قافل | ئاگر . ئاسن . ئاشت . باسك . ماست . بانگ . راست . سارد . كارت . ناسك . لانك ! رانك . خاتر . مانگ . |

| کێش | نموونە |
|---|---|
| **قافەل** | ســاوەر · وایەر · چاوەش · باوەڕ · پاکەت · خاوەن · باڵەك · |
| **قافول** | تاوول · کاوول · کــاووڕ · لاووك · شاوول قاووت · تاووس ·· |
| **قافوول** | مافووت · ئاموور · بارووت · چاپووك · قاپووت · خاپوور ··· |
| **قافال** | بــادام · کــالان · پــاوان · هاوار · ماتان · توان · |
| **قافیل** | تاریــك ! باریــك · باهیف · قامیش · پاییز · دابین · کاریت · |
| **قافێل** | ئامێز · بازێــڕ · واغێــن · هاوێر · پارێز ، داوێن · |
| **قوفل** | کورد · توند · گورج · خو شك · کــورت · چوست · گو نــد · کولم · قورس · قولپ · گو نـج گــورگ · زونــگ · کــولك · بوخت ·· |
| **قوفال** | گومــان · دوکان · کوتاڵ · چوار · زوبان · خومار ( تەم ) سوار · گووان · خوسار · قوماش · خووار · سووال · قولاپ · سوواخ ·· |
| **قوفیل** | گوریس · زوویر · کووین · خــوویش · کــوریس · کــووێر · |
| **قوفێل** | شوفێر · شووێن · سووێر · جووێن ·· |
| **قۆفل** | کۆسپ · گــۆفك · قــۆرت · کۆتر · سۆتك · کۆشك · دۆست · |
| **قۆفەل** | دۆزەخ · مۆتەك · کــۆزەر ! چۆرەگ · کۆتەل · لۆژك · گۆزەر · |
| **قۆفال** | سۆراخ · گۆچان · تۆراخ · کۆڵان · تۆمار · هۆباڵ · دولاب ·· |
| **قێفل** | گێــوژ · فێنك · رێشــم · ( مێرگ · مێوژ · نێوك · چێرگ ·· ) دارژاون · |
| **قیفل** | بیــور · ژیشك · بیست · چیلك · ڕینگ · شینگ ··· |
| **قێفەل** | تێــکەل · مێزەر · خێرەت · سێبەر · هێلەك · گێچەل · گێزەر ·· |
| **قیفەل** | کیسـەل · فیشـەك · شیوەن · تیوەش ؛ زیرەك · میخەك · |

| کێش | نموونە |
| --- | --- |
| ڤیفاڵ | ڕێواس ٠ تێوار ٠٠ ( بێگار ٠ لێــوار ٠ گێـلاس ٠ شــێواز ٠٠ ) دارژاون ٠ |
| ڤیفال | فیشال ٠ کیفار ٠ ســیغار ٠ میــوان ٠ ( گیــاڵ ٠ دیوار ٠٠ ) دارژاون[1] ٠ |
| ڤفلڤ و ڤفلڤو | بەشی زۆری نموونەی ئــەم دوو قالبەو لقەکانی‌یان ســادە نین‌و دارژاون ، وەك : |

درشت ٠ برشت ٠ فلــرخ ٠ ســروشت ٠ دروســت ٠ بنێشت ٠
سندان ٠ گرگاز ٠ سنجاق ٠ گرکان ٠ زینــدان ٠ گیــرفان ٠ قــەزوان ٠
دەرمان ٠ پەیمان ٠ مەیدان ٠ هەرزان٠ خــەرمان ٠ قــارەمان ٠ بازرگــان ٠
کەمتیار ٠ هــەوراز ٠ پەرێشــان ٠ هەوســار ٠ باینجــان ٠ حەیزەران ٠
گەردوون ٠ مــەقەست ٠ هەڵمــەت ٠ پــەلامار ٠ تــەوژم ٠ بەهــەشت ٠
درەخت ٠ ئێســـتر ٠ ســــەغڵەت ٠ شــەپرێو ٠ خــووێری ٠ تــەوژم ٠
تــەلــەسم ٠ تــرماسك ٠ نــقورچ ٠ ترکــەش ٠ دەروێش ٠ هــەرەوەز ٠
تۆێکل ٠ گــوهــەر ٠ مــرواری ٠ قەڵبــەزە ٠ قەرتاڵــە ٠ قەرســـــێل ٠
پەنجەرە ٠ فــەرتەنە ٠ زەمبــەلەك ٠ قورقوشم ٠٠ ٠

## جۆری دووەم ـ ووشەناوی دارژاو :

ئەم‌پاشگرانەی بــەرەوە لەگــەڵ تالوتەرا پێشگری وەك ( ئا ، را ٠٠ )

---

### تێبینی

(١) مەبەست لە خشتەناوی‌سادەدا ، دەرخستنی قەبــارە ـ فــۆرم ـ ی وشـــەی ســـادەیە ، بـــە یاســای دەنــگ + بــزوێن‌و دەنــگ + بزوێن + دەنگ مەبەست ئەوەنیە کە کێش ( وزن ) وەك لەعەرەبیدا ، بۆجۆرە وشــەی کوردی ســازبــدەین ٠ تەنیــا کــۆ کردنەوەی ئـــەو وشەســادانەیە بەو قالبە تایبەتیانە ٠

**ووشەی سادەی ناوی دائەرێژن :**

( ە · ا · وو ·· ۆ · او · اوا · ی · ێ · وێ · او · ەن · انــــە ·
ین · ینــــە · ێن · ینە · وا · وان · وانە · ك · كــە · ۆك · ەكی · كار ·
گــــك · گــــــــــە · گــــــــا · گا · گەر · گار · ل · ل · ەل ·
ال · ۆل · ەڵان · ر · ور · ار · یار · ز · را · ش · یش · تــــە ·
تا · ما · مان · مەند · مەنی · ند · اند · بەند · نامە · چە · چی ·
ست · شت · شك · چــكە · لكە · كەڵە · دار · زار · جاڕ · ســــاز ·
باز · دان · ستان · خانە ····

**تەماشــــای خشتەكە بكە :ـ**

# خشتەی ووشـەناوی دارژاو

| نـاو | ئاوەڵنـاو | جێکات | رگڤەد | ژمـارە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| دەستە ، مشتە . | چاکە . خەراپە . | سەرە . سەرەتا . | رستە . نرشتە . | ژمارەی سادە : |
| تاوە . خانە ، بانە . | شلە . گەرما . سەرما . | شەوە . رۆژوو . | دارشتە . دانستە | ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، |
| دارا . سەرا . خانا . | (ساردما) . جووانوو . | بەرە . بەرایی . بەرۆك . | پرسە . جوولە . | ٥ ، ٦ ، ٧ ، ٨ ، |
| خانو ، بانوو . کەلوو . | سوویروو . ئمانوو . | بەرگ . بنە . بنکە . | بەستە . بەستوو . | ٩ ، ١٠ ، ٢٠ . |
| بەهاروو . کلۆ ، پەرۆ | حارۆ . دیرۆ . بلاو . | بنار . بناوان . | بەستەلەك . گیرا . | سی ٣٠ ، ٤٠ ، |
| زارۆ . شانۆ . مالۆ . | خاوێ . شلوێ . | بنۆك . بنیشت . | گیرۆ . کردەوە . | ١٠٠ ، ١٠٠٠ ، |
| خانی . فایی . کاشی . | دێرین . نەرمین . | بنەما . بناو . بنج . | سووتو . رابردوو . | ژمارەی دارژاو : |
| کرمێ . هەرمێ . گلاو . | گەرمێن . نووێن . | دەرك . دەریا . | کردار . رەفتار . | ٥٠ ، ٦٠ ، |
| گلەیی . سەرایی . | زەردێنە . سپێنە . | دەرامەت . دەرەتان . | گرفتار . | ٧٠ ، ٨٠ ، ٩٠ . |
| دەسك . پەلك . | رشکینە . شلکێنە . | دەربەند . دەرگە . | چنار . خوسار . | چلە . چارەگ |
| گرلوك . کیفۆك . | کەچك . شالك . | جێگە . رێگە . ناوك | بریار . پرسیار . | جەفتـــە ، |
| پیتاك . پووشکە . | گەرمك . کرتەك . | نێوان . ناوند . | نیشتمان . | حـەوتم . |
| دێمکە . کارگ . خالیگە . | لاوك . تاریك ! . | ناونج . ناوەرۆك . | ساختمان . | حـەوتەوانە |
| قەلانگ . بارگین . | رووناك . رەشکە . | ناواز . پێشرەو . | درووما‌ن . | پـەنجە |
| کولەجە . سەرنج . | قولکە . نەرمکە . | پێشین . پێشینان . | گرتەك . بەستەك . | شـەشـەلان |
| میزەلان . | | پێشانی . پێشکە . | | |

## خشتەی ووشەناوی داڕژاو

| نـاو | ئاوەڵنـاو | جێکات | رگقەت | ژمـارە |
|---|---|---|---|---|
| قوپچە • دۆلچە • | پانکە • لووسکە • | پیشەنگ • | خـزوك • | ژمارەی لێکدرا |
| مێوژ • بانیژە • | مزرۆکە • زوورگ • | پێشنپار • پاشوو • | خشۆك • رووەك • | ١١ ، ١٢ ، ١٣ ، |
| کارێز ، رەگەز • | چرگە • رەشانگ • | پاشل • پاشکۆ ا• | پۆشاك • خۆراك • | ١٤ ، ١٥ ، |
| خەون • سەرین • پەرژین | دوورگە • پەرژین • | پاشەوار ، پاشەرۆك • | برگ • برینگ • | ١٦ ، ١٧ ، |
| مێرووله • کاریلە • مێشووله | ترسنۆك • ترسناك • | پشتێ ، پشتێن • | بێژنیگ • | ١٨ ، ١٩ ، |
| تاول • داول • کەندال • | سووراتك • زووبە • | پشتیر • پشکۆ • | گوتار • ووتار • | (٢٠٠) ت (١٠٠٠٠) |
| خەوالوو • چەنگال • | فشەڵ • گەندەڵ • | سەروو • ژێروو • | بربەند • رنەك • | (١١٠٠٠) تا سەد |
| خەلات • بەرات • | گرژال • پۆخل • | ژووروو • دەروو • | کوشتار • کرێژ • | هـەزار |
| کاریتە • ئاوێتە • فریشتە | پاکژ • پاکیزە • | پاشوو • خواروو • | سـووتینە • | (٠٠٠ر١٠٠) تا |
| مریشك • گەلیشك • | نووێژ • شێواز • | لایەن • راستە • | درك • برك • | (٠٠٠ر٩٠٠) |
| دەستوور • لێوار • | جیاواز • پەرتەواز • | چەپە ، چەپۆك • | بربیسکە • | هەر بەو |
| کارامە • هەرامە • | سازگار • رەقە • | بەیانی • ئێوارە • | قرتێنە • زانکۆ ! | جۆرەش |
| گیابەند • یادگار • گلۆواز | رووتەڵ • تالیشك • | سبەێنی • شێوان • | دروێنـە • | یەکانو |
| شالوار • شالیار • | ترشیات • بێزوو • | خەوتنان • پێرێ • | کوتـەك • | دەیانو |
| کەوپار • مێردەزمە | شرۆڵ • گرت • | دوێنێ • پێرار • | گرینۆك • | سەدانن |
| | | | | ملیونان • |
| | | | | سیێەك |
| | | | | چلیەك |

**ووردبوونەوە :**

١ ـ هێندێ پێشکری دارێژ هەن فەرامۆش کراون ، وەك :

ئا/: ناراستە · ئاساغ · ئاکام · ئاکو · ئاهانگ · با/: بادین · بالێف · باکۆ · رە/: رەگەل · رەنووس · رەنێو · را/: راوێژ · رادار · سا : ساکاو ، سارێژ ·

٢ ـ هێندێ پاشکر بەنۆرە ووشەییکە دانەرێژن :

دارا · داروچکە · دارك ·· بەر : بەرین · بەرۆك · بەرایی ·

چۆری سێیەم ـ ووشەناوی داتاشراو ـ سازاو ـ :

جارێکی دی پاشکرەکان · دەخرێنە گەل دەستەووشەی ناوی سادەو هێندێ ووشە دارژاوو لێکدراویش ، بۆ ساز دانی مەبەستی رێزمانی وەك : کوێیەتی مەلبەندو ناوچەو تیرەو رێبازو چۆنیەتی پیشەو هونەر نیش‌وکار ·· هەموو جۆرە ووشەیێکی ناوی لەمەدا بەشداری دەکات بەتایبەتی ناو لەهەموویان چالاکترە ، لەبەرئەمە ئێمە نموونەکانیان تێکەل بەیەکتری دەکەین · ئەوسا خوێنەرەوە لەنموونە هاوشێوەکانەوە دەتوانێ مەبەستە رێزمانی‌یەکە بدۆزێتەوە · ئەشبێ چەندگرۆپ وەك : ( خانە · دان · ستان · زار · جار · ۆلآن··· ) بۆ یەك مەبەست بن :

١ ـ (ا) :

زانا · دانا · توانا · هێزا · وریا ـ ووردیا ـ · کارا · تازا ··

٢ ـ (ن) :

وورگن · چلکن · گۆشتن · سەرقژن · شەرمن · تووکن · لیکن ··

٣ ـ ( ەن ، انی ) :

رەقەن · رووتەن · ریزەن · چیمەن · تەختانی · نەرمانی · گەرانی · بەرانی · پالآنی ·

٤ ـ ( ان ) :

گەرمیان · مەریوان · باخیان · سنلۆلآن · بازیان · بادینان · موکریان ··

٥ ـ ( انه ) :

سەرانە ٠ بارانە ٠ پووشانە ٠ باجانە ٠ مەڕانــە ٠ بزنانە ٠ ڕەزانە ٠ ملکانە ٠ توتنانە ٠٠ سالآنە ٠ مانگانە ٠ جێژنانە ٠ شاگردانە ٠ کوڕانە ٠ کچانە ٠ پیاوانـە ٠ ژنانـە ٠ منداڵانـە ٠ مـەردانە ٠ شـیرانە ٠ کـەرانە ٠ شایانە ٠٠ سوێندەگورگانە ٠

٦ ـ ( ین ، ینه ) :

دارین ٠ ئاسنین ٠ زیڕین ٠ ئاگرین ٠ پۆڵایین ٠ مسینە ٠ بەردینە ٠ تێرینــە ٠

٧ ـ ( ێن ٠ ێنه ) :

کـــەلایێن ٠ ســـــایێن ٠ تۆپێــــن ٠ کاڵەمستێن ٠ کێلبــەردێن ٠ کۆکۆیێن ٠ بازبازێن ٠ غارغارێن ٠ میرمیرێن ٠ چەڵەمشکێن ٠ پاشاوموسایێن٠ گزگلێن ٠ هەڵۆکێن ٠ کلاوێن ٠ ماشـێنە ٠ نیسکێنە ٠ ترخێنە ٠ کوڕێنی ٠ کچێنی ٠ بووکێنی ٠ خورێنی ٠

٨ ـ ( ەوا ٠ ەوان ٠ ەوانه ) :

پێشـەوا ٠ چارەوا ٠ نانەوا ( نانەوان ) پاسەوان ٠ دارەوان ٠ قاپیەوان ٠ باخەوان ٠ ڕەزەوان ٠ شاخەوان ٠ ئاشـەوان ٠ مەلەوان ٠ کەشتیەوان ٠ دەرگەوان ٠ بەرخــەوان ٠ مەڕەوان ( شــووان ) بزنـەوان ٠ وەڵاخــەوان ( گاوان ) شارەوان ٠٠ پاوانــە ٠ دەســـــتەوانە ٠ ملــوانە ٠ کۆلـوانە ٠ ڕاستەوانە ٠ چەپەوانە ( پێچەوانە ) ٠ ملوانکە ٠ بەروانکە ٠

٩ ـ ( چه ٠ چی ) :

ناوچە ٠ باخچە ٠ دەریچە ٠ دەریاچــە ٠ کەمانچە ٠٠٠ چـەرچی ٠ تووتنچی ٠ ڕاوچی ٠ کاروانچی ٠ دەرمانچی ٠ کازمێرچی ٠ تەنـەکەچی ٠ فانۆنچی ٠ بۆیەچی ٠ پینــەچی ٠ کەبابچی ٠ ئوتێلچی ٠ کرێچی ٠ توونچی ٠ گەرماوچی ٠ کویستانچی ٠ کارخانەچی ٠٠

١٠ ـ ( گەر • گار ) :

زێوگەر • مسگەر • زێرگەر ( زێرنگەر ) ئاسنگەر • کیمیاگەری • پولاگەر • شووشەگەر • تەلگەر • سیمگەر • فافۆنگەر • لەوحگەر • پێشەگەر •• شەوگار • پارێزگار • پەروەردگار • کردگار •••

١١ ـ ( کار • کاری ) :

کرێکار • بەرکار سەرکار • نیوەکار • بریکار • خزمەتکار • نۆکار • ( نۆکەر ) هەرزەکار • دەستکاری • بەردکاری • ووردکاری • پاچکاری • گەچکاری • ئاسنکاری • دارکاری • گەلکاری • هێلکاری • نەخشکاری • سیپکاری •

١٢ ـ ( یار ) :

کڕیار • فرۆشیار • بەختیار • جوتیار • هۆشیار • شاریار • ئەندازیار •

١٣ ـ ( دار • داری ) :

گیاندار • باڵدار • شاخدار • گوڵدار • پایەدار • ساماندار • دوکاندار • پارەدار • مەڕدار • حەیواندار • زۆردار • بەشدار • ئاگادار • فەرماندار • ئاودار ، ماڵداری • دەستداری ، بەشداری ••

١٤ ـ (ەوەر • ەوار ) :

سەروەر • بەختەوەر • داوەر • زیندەوەر • کوێرەوەری • لێرەوار • ئاسەوار • شووێنەوار • پاشەوار • خوێندەوار • کوردەواری • هاوینەهەوار ••

١٥ ـ ( مان • مەند ) :

موسڵمان • قارەمان • تورکمان • ئۆردمان • ساختومان • نیشتمان • وایرمان • سوودمەند • بەهرەمەند • هونەرمەند • دەوڵەمەند • خێرۆمەند ••

١٦ ـ ( نـده ) :

ناوبند ، پێوەند ، خوواوەند ، پاڵندە ، دڕندە ، گۆڕیندە ، فەرماندە ،

١٧ ـ ( ۆك ، ەكی ، كۆ ) :

سەرۆك ، خڕۆك ، فڕۆك ، خشتۆك ، گەڕۆك ، مژۆك ، سەرەكی ، دەرەكی ، كەرەكی ، پوولەكی ، ئاوەكی ، لاوەكی ، پێشەكی ، دەشتەكی ، خانەكی ، سەرزارەكی ، دووبەرەكی ، پەنامەكی ،، پێشكۆ ، پشتكۆ ، پاشكۆ ، شێركۆ ، زانكۆ ، گلكۆ ، چینكۆ ، داركۆ ،

١٨ ـ ( زا ، زاد ) :

باوكزا ، دایكزا ، ئامۆزا ، خاڵۆزا ، پوورزا ، خوارزا ، برازا ، كوڕزا ، كانزا ، كچزا ، خوشكزا ، شارزا ، شێرزاد ، نەوزاد ، شازادە ، مەلازادە ، شێخزادە ،

١٩ ـ ( ساز ، باز ) :

فەنباز ، فیلباز ، تەڵەباز ، ڕێباز ، بەردباز ، سێباز ، ژۆینباز ، شیربازی ، ئاگربازی ، چاوبازی ، دەستبازی ، مێبازی ، ڕیابازی ، كارساز ، دانساز ، چاوساز ، پێشەساز ، تەنەكەساز ، چەخماخساز ،

٢٠ ـ ( گە ، گا ) :

زانگە ، ڕووانگە ، كارگە ، هەوارگە ، كۆمەڵگە ، ئیستگە ، فێرگە ، دەرمانگە ، شتلگە ، بشۆرگە ، حەشارگە ، خویندگە ، زانستگە ، كۆگا ، دەستگا ، هوردووگا ، پێشانگا ، ئارامگا ، یاریگا ، هونەرگا ، پاسگا ، پارێزگا ، بارەگا ، سەیرانگا ، نومایشگا ، كانگا ،

٢١ ـ ( خانە ) :

كارخانە ، دارخانە ، ئاسنخانە ، تەلخانە ، دیوەخانە ، باڵەخانە ، قوتابخانە ، مووزەخانە ، نامەخانە ، كتێبخانە ، پۆستەخانە ، خەستەخانە ،

تیمارخانە ٠ نەخۆشخانە ٠ دەرمانخانە ٠ پولیسخانە ٠ چاخانە ٠ میوەخانە ٠ ئوتێلخانە ٠ میوانخانە ٠ سەربازخانە ٠

٢ ٢ـ ( دان ) ، کۆنەو کەمە :

ئاگردان ٠ کادان ٠ شەکردان ٠ مۆمدان ٠ خوێدان ٠ تیردان ٠ یەغدان ٠

٢٣ ـ ( ستان ) :

کوردستان ٠ ئەفغانستان ٠ تورکستان ٠ عەرەبستان ٠ فارستان ٠ کێوستان ٠ دارستان ٠ شاخستان ٠ شارستان ٠ گۆرستان ٠ قەبرەستان ٠

٢٤ ـ ( زار ، جاڕ ) :

گوڵزار ٠ نێرگزار ٠ چەمەنزار ٠ مێرگزار ٠ درکزار ٠ کۆسار ( کۆزار چەوزار ٠ تووتنجاڕ گڵجاڕ ٠ نێرگزجار ٠ لمجاڕ ٠

٢٥ ـ ( ەڵان ، ەڵێن ) :

بەردەڵان ٠ شێوەڵان ٠ بیشەڵان ٠ قامیشەڵان ٠ پووشەڵێن خیزەڵێن ٠

٢٦ ـ ( ەمەنی ) :

دارەمەنی ٠ خواردەمەنی ٠ ساردەمەنی ٠ چاپەمەنی ٠ شیرەمەنی ٠ پووشەمەنی ٠ شیرینەمەنی ٠ مزرەمەنی ٠ خواستەمەنی ٠ سووتەمەنی ٠

٢٧ ـ ( او ، اوا ) :

بەهۆی سووانەوەو زۆر بەکارهاتن وەکو پاشگری لێ هاتووە :
تەنکاو ٠ سەراو ٠ گۆماو ٠ گڵاو ٠ ئاسنەڵاو ٠ بەراو ٠ دەراو ٠ ماستاو ٠ شاڵاو ٠ خاکاو ٠ دیراو ٠ ماکاو ٠ سوێڵاو ٠ قوڕاو ٠ لافاو ٠ پاراو ٠ میراو ٠ دەستاو ٠ چاڵاو ٠ بەنداو ٠ کەنداو ٠ تۆبزاوە ٠ گەنکاوا ٠ ئاڵیاوا ٠ ژاراوا ٠ سەیداوا ٠ قەلاوە ٠ حاجیاوا ٠ عەنکاوا ٠ قازیاوا ٠ باساوا ٠٠

٢٨ ـ ( بەند ) :

رووبەند ٠ سەربەند ٠ کەمەربەند ٠ ملبەند ٠ میخەکبەند ٠ تەلبەند ٠

شووشەبەند ・ ناوبەند ・ دەستبەند ・ بازووبەند ・ مەلبەند ・ نالبەند ・

٢٩ ـ ( نامـە ) :

فاڵنامە ・ ســاڵنامە ・ بەختنامە ・ کورتەنامە ・ گلەیینامە ・ بەرنامە ・ خەونامـە ・

٣٠ ـ ( ۆك ・ کـە ・ لـە ・ ل ・ لــە ・ چکە ・ کـەڵە ) ـ بۆ بچووك کردنەوە :

بەرووله ・ قتـووله ・ بەرخۆلە ・ کاریلە ・ گەندەل ・ گرمۆل ・ مچۆل ・ حەلیمۆك ・ تیرۆك ・ بزنۆکە ・ مەرۆکە ・ شتۆکە ・ دەسرۆکە ・ تەپۆلکە ・ گردۆلکە ・ ساوێلکە ・ چاوێلکە ・ چووێلەکە ・ گوێچکە ・ داروچکە ・ خانوچکە ・ شاروچکە ・ ڕێچکە ・ کورتەڵە ・ ژیرکەڵە ・ باریکەڵە ・ زەرکەڵە ・ درێژکۆلە ・ شیرشیرۆکە ・ خالخالۆکە ・ جروانکیلە ・・

هەروەها ، بچووك کردنەوە بەقرتاندن و سووکەکردنی پیتی ناویش ئەبێ :
حەمــە ・ خلـە ( خـدر ) ・ خولـە ・ ( محمود ) ・ عەبە ・ ( وسو ) ・ ( ســێمان ) ・ سمایل ・ عــەزە ・ ئەحە ・ ئامە ・ فاتە ・ خەجە ・ چنــە ・ نەجە ・ کەژە ・ بەخە ・ تالە ・ قالە ・・・

جگە لەم پاشگرانە هێندێ پیت و ئامرازی پێشگریش ، ناوی داتاشراو سازئەدەن ، وەك :

١ ـ ( بــە ) :

بەفیز ・ بەناز ・ بەرێز ・ بەدین ・ بەسوود ・ بەخەبەر ・ بەکەیف ・ بەشوو ・ بەمێرد ・ بەرەنگ ・ بەهێــز ・ بەپیت ・ بەکـەڵك ・ بــەرۆژوو ・ بەناوبانگ ・・

٢ ـ (بێ ) :

بێبــار ・ بێچارە ・ بێدەنگ ・ بێتــام ・ بێکەس ・ بێهێز ・ بێچاو ・ بێگوێیی ・ بێدینی ・ بێدەنگی ・・ لێرە ، کە ( بێ ) یەکە واتای خۆی

گوم کردبوو دەبێ ، بەووشەکەیەوە بنوسرێ ، وەك :

بێکەس ، بێسارانی ، بێخود ، بێخال ، بێگانە ، بێدار ، بێگار ، بێزار ، بێرەزا ، بێهوودە ، بێجگە ، بێنەوا .

٣ ـ ( نە ) :

نەزۆك ، نەبەز ، نەفام ، نەخۆش ، نەدیو ، نەدار ، نەزان ، نەوێر ، نەشارەزا .

٤ ـ ( نا ) :

ناکەس ، نامەرد ، ناچار ، ناساز ، نابینا ، ناخۆش ، ناساغ ، ناشیرن ، ناپیاو ، نارەوا ، نابەلەد ، نارەوان ، ناجوان ، نارەسەن ، ناپەسند ، نارەحەت ، ناحەز ، ناکامی ، ناتەبایی ، نالەباری ، نامەردی ، نارەزایی ، ناشادی ، ناوەخت .

## جۆری چووارەم ـ ووشەناوی لێکدراو :

دەستەووشەی ناوی بەتایبەتی ناو ، سیفەت ، جێکات ، ژمارە ، لەخۆیان‌و لەیەکتری ئەدرێن‌و دەکرێنە ناو بۆ یەکەشت بەیەکێك لەم رێچکانە :

### ١ ـ لێکدانی راستەوخۆ ، وەك :

دەستنوێژ ، بەردەئاش ، کەرتەشی ، ئاودەست ، کابرا ، رێبوار ، کەلابەرد ، بەردنەستێ ، گاجووت ، تەورداس ، نێرگز ، دارتوو ، داربەڕوو ، دارگوێز ، دارتەل ، داردەست ، دارماڵ ، چاتێژ ، دەنگخۆش ، قسەشیرین ، زمانڕەوان ، سەرزل ، پێخوواس ، دەستدرێژ ، گوێپان ، چاوساغ ، دەستڕاست ، رەشماڵ ، دڵپاك ، قژلوول ، ملقەوی ، سمخر ، سینگپان ، ئامۆژن ، وەستاژن ، سوورکێو ، تەڕدەست ، قەدبڕ ، نەوبەهار ، نەونەمام ، هاورێ ، هاوسەر ، هاوماڵ ، هاوزمان ، هاودەم ، سەرقاپ ، سەرتروێ ، سەرپەنجە ، سەرخۆش ، سەربان ، سەرمۆر ، سەرقاڵ ، سەرپەل ، سەرچۆپی ، سەرتیپ ،

سەرکێش · سەرتەنگ · بەردەست · بەرماڵ · بەرنوویژ · بەرهەم · بەربانگ · بەرچیخ · بنبار · بنکوڵ · بنمیچ · ژێرکەراس · ژێرخان · ژێرپیاڵە · ناوقەد · ناوبانگ · ناوئاخن · ناوکەف · ناوچاوان · ناوخۆ · ناوساجی · پێشنوویژ · پێشکێش · چێشتهەنگاو · پاشنوویژ ·· دووگەرد · دووشەش · دووبەر · یەکقسە · یەکجار · سێشەممە · سێگۆشە · چوارپێ دووروو · رووبەر ·

بەردبەرد · دەنکدەنک · کونکون · سپیسپی · ووردوورد · لەتلەت · کەمکەم · پۆلپۆل · جارجار · ساردسارد · چوارچوار · زووزوو · کزکز · چلچل · دوودوو · سێسێ · ببڕایببڕای ··

## ٢ ـ لێکدان بەناوندی پیتی « ە » :

رەشەبا · گاشەبەرد · دارەبەن · نیوەرۆ · نیوەچل · ئاژەمار · بەردەنوێژ · خاکەناز · گلەبان · بارەدار · چاوەزار · چاوەڕێ · مانگەشەو · دەنکەجۆ · مەرەتێوی · دێلەوورچ · هێلانەکەو · لانەشێر · کونەگورگ · کولانەمریشك · کانەمس · کانەبەرد · کانەنەوت · کانەئاسن · کانەگۆگرد · دەستەجل · دەستەبرا · راوەژێشك · خۆلەمێش · چرەدووکەڵ · لووتەلا · چارەسەر · خانەخێو · چالەکۆن · چارەگران کونەدوست · شۆڕەسوار · بۆرەپیاو · مزرەسێو · ترشەسماق · سەرەڕێ · سەرەداو · بەرەباب · بەرەجووت · بنەسێو · بنەگیا · ناوەراست · نیوەشەو · پاشەسەر · پاشەرۆژ · پاشەدەنگ · پێشەسەر · پشتەسەر · کەڵەژن · کەڵەپیاو · کەڵەشێر ، کەڵەگا · قرەقر · خورەخوڕ گفەگف · هاڕەهاڕ · هاژەهاژ · هێڕەهێڕ · گارەگار · قاڕەقاڕ · قیڕەقیڕ · جیوەجیو · گرمەگرم · حیلەحیل · ژاوەژاو · هۆڕەهۆڕ · سرتەسرت · کرتەکرت · فرەفڕ · بۆڵەبۆڵ · دارەدار ··

٣ ـ بەپاشبەندی پیتی « ە » :

دووپشکە · ئاوبارە · چوارچێوە · بندەستە · ژێردەستە · دەستمایە ·

سەردەستە • سەرچاوە • پاشماوە • پێلێژە • دەرخۆنە • لاگیرە • سێپایە • سێکوچکە • گرندۆرە • دەستکەنە • دەروازە • گورنەتەلە • رەشــتالە • قەرتالە • مەرکانە • ناوناوە • فرفرە • زەرگەتە • رەورەوە • تەپتەپە • پرپرە پڵپڵە • زرزرە • ژەمژەمە برپرە • کەمکەمە • فیتفیتە • کرکراکە • قمقمۆکە • گەسكگەسكە ( گیایێکە ) •

٤ ـ بەناوندیو پاشبەندی پیتی « ە » :

کوندەسمە • گوڵەئەستێرە • پندەگوولە • زەرنەقووتە • داشەهارە • فیشەکەشێتە • ئەم گوڵە زەردەیە • هاوینەهەوارەکە • کەراسەشینەکە • چالەقوولەکە • بنەمالە • بەردەووردە • سیخەسۆلە • گوڵەبەرۆژە • هەنجیرەبایە • هەنارەترشە • هەوارەبەرزە • دەستەسرە • پاشەملە • پیازەخووگانە • پەلەپرووزە • کەندەکەوە • بەرەبەرە • ووردەووردە • دەنکەدەنکە نەختەنەختە •

٥ ـ بەناوندی پیتی « و » :

گروگاڵ • گاوگزل • کەلوپەل • زبلوزاڵ • کشتوکاڵ • درکودال • • • ئیشوکار • پرووپاتاڵ • عەرزوحاڵ • شرووشاتاڵ • مرومۆچ • چرچولۆچ • نەرمونۆڵ • چەپوچیر • پانوپۆر • کردوکۆش • چلوچێو • مێووروون • کتوپڕ • گەرموگور • پروپوچ • پروپاگەندە • راستودروست • شتومەك • کەژوکێو • شاخوداخ • دەوروبەر • ساردوسڕ • گوفتوگۆ • چاووراو • کلۆکۆ • شلتوشۆ • پوشەپەلاش • زرموهور • دارومار • خۆلومۆل • •

٦ ـ بەناوندی پیتی « ەو ، ا ، او ، ان » :

راستەوسان • دەرەودیو • راستەوخۆ • سەرەوژوور • سەرەوژێر • دەمەونخون • دەمەوبەهار • لینگەوقووچ • پاشەوپاش • مەیلەوسارد • مالەومال • دیودودیو •

پشتاوپشت • شیوواوشیو • دەستاودەست • دۆلودۆل

دووراودوور ، رەنگاورەنگ ، بەراوورد ، بناگوێ ، سەراسیمە ، سەراسوێ ، بەرانبەر ، سەرانسەر ، سەرانکوێلک ، زێراندۆن ، سەرانگرێ ..

٧ ـ بەناوندی پیتی « بە ، لە » :

دەستبەسەر ، دەستبەجێ ، سەربەخۆ ، چاوبەکل ، قوڕبەسەر ، جێبەجێ ، رووبەروو ، ناوبەناو ، دێبەدێ ، کونبەکون ، لابەلا ، دەستبەدەست ، ملبەملە .

سەرلەنوێ ، سەرلەبەر ، شەولەبان ( باگردێن ) دەستلەشان ، قاپلەمە ! ، سرێشلەمە ! ، چاولەبەر .

## هێندێ نیشانە لەگەڵ ووشەی ناویدا :

١ ـ ئەم پیتانە : ( ی ، ایی ، ەتی ، ایەتی ) :

ناوی بەرجەستە ( ماددی ) وەکو : شل ، خەست ، دز .. دەکەن بەناوی بێجەستە ( معنوی ) ، جگەلەوەش (ی) بۆ پاڵدان ( نسبة ) بەشوێنو نەریتو رێبازەوەیە ، وەك :

ا ـ (ی) بۆ کوێیەتیو چۆنیەتی :

دزەیی ، خۆشناوی ، پشدەری ، مەنگوڕی ، مەرگەیی ، هەولێری ، سنەیی ، گەرمیانی ، کرماشانی ، هەورامی ، زازایی ، مازندەرانی ، شنۆیی ، مەریوانێ ، قەزوێنی ، لادێیی ، شارستانی ، قەزوانی ، بنەوشەیی ، قاوەیی .

ب ـ (ی) بۆ ناوی بێجەستەیی نیزیك :

جوانی ، پیری ، گەنجی ، لاوی ، کزی ، قەڵەوی ، گەورەیی ، بچووکی ، درێژی ، پانی ، بڵندی ، بەرزی ، نزمی ، سستی ، چوستی ، شلی ، خەستی ، بەختەبەری ، ئازادی ، بێچارەیی ، بێدەنگی ، ناکامی ، نامرادی ، ناساغی ، سەرسامی ، دەستدرێژی ، ژێردەستی ، سەربێیی .

دەربەدەری · زمان‌لووسی · چارەگرانی · رووح‌سووکی · یەکسەری · یەکجاری · بەرچاوی · پرکێشی · شەرمەزاری سەربەستی · سەربەخۆیی · دەنگ‌خۆشی · پێش‌نوویژی ·

ج ـ ( ایی ) بۆ ناجەستەیی دوور لەهەستیار :

مەزنایی · بلێندایی · زەردایی · بەرزایی · پانایی · درێژایی · قوولایی · کوێرایی · تەنکایی · تاریکایی · دارایی · سەوزایی · چەورایی · شینایی · بەرایی · سەرەتایی · شیرنایی · تالایی · رەشایی · تارمایی · گەرمایی · ساردایی ·

د ـ ( ەتی ، ایەتی ) بۆ ناجەستایەتی دوورونیزیك :

برایەتی · کەریەتی · پیاوەتی · خوایەتی · فەقێیەتی · مەلایەتی · شێخایەتی · ئاغایەتی · بەگایەتی · میرایەتی · پاشایەتی · شێتایەتی · گەورایەتی · خزمایەتی · دۆستایەتی · ئاشنایەتی · کوێخایەتی · شینکایەتی · فێنکایەتی · کوردایەتی ·

٢ ـ لەنیشانەی ناساندن :

أ ـ ( ی ، یٚ ) :

ئەم دوو پیتە لەهەندێ ناوچەدا بۆ بیرهاتنەوەی شتی زانراو بەهۆش دەخرێنە دووا ووشەکەیەوەو دەلێن :

سبەینێ زوو هەستا ، چوو بۆکن خانی ، شاعەبباسی · سولتانی · وەکو ماری لەسەر دیواری · لەرەنگی سەماوەری · قسەی پر بەزاری ·· نە لەدنیایێ نە لەقیامەتێ · بەهاوینێ · لەحەجێ · لەکن مەلای جزخینێ ·· چێشتێ لێبنێ · قسەی خوشی لەگەل دەکا · شەوێ بەئاسوودیی نوست · لەکرمانجی ژووروشدا دەلێن :

گوتنێت میری عەرزی سولتانی بکە ، دبێژێتن ب زاری ناچمە نێر مەزاری · وێ شوورێ خوە هەلدە ، ژ بانی فەخوە بەردە · مەروونە وێ

ئافتابێ • نەرشێنە لێ گوڵابێ • خباتێ بکە خیاڵێ نەکە •

ب ـ (ە) ی کورتکراوەی ( ەکە ) بەڵام کەمە :

دایکە زیندووبۆوە • ڕێـویە بەتەڵـەوە بـوو • شـــووانە ماندوو بوو • سەگە هەر بەدوایەوە بوو • کۆترە دنووکی بوو بەداوەوە •

ج ـ ( ەکە ) ی ناساندن :

ئەمپیتە بۆ بیرکردنەوەی شتی بینراو یا ناسراو دەخرێتە دووا ناوی سادەو داڕژاو داتاشراوو لێکدراو ، تاکبێ یان کۆ ، بەڵام نیشانەی ( ان ) ی کۆ دەچێتە پاشەوەی و شیوەی ( ەکان ) دەگرێ •• : کابرایەکە • پیاوەکە • چیمەنەکە • ئاسنگەرەکە • ئەندازیارەکە • ســەرپۆشەکە • چیمەنبڕەکە • دێیەکە • هاورێیەکە • بەرگدرووەکە • خانەخێـوەکە • دوکـانداره‌کە • ماڵەشێخەکە • بارەدارەکە • پیاوەدرێژەکە • دەنگەنەرمەکە • فافۆنچییەکان • دێیەبەراوەکان • پیاوەکان • ژنەکان • هاورێیەکان ••

٣ ـ نیشانەی تاکیەتی ( ەك ، ێك ) :

ناوی نەناس ئەوەیە نە ناسناو (عَلَم) و نە نازناو بێ ( ئەم ) و (ئەو) و ( ەکە ) شی پێوە نەبێ وەك : خاك • مـەڕ • کۆسپ • گڵەسپی • جـا ناوی نەناس سادەبێ یا ناسادە ، نیشانەکان وەردەگرێ بەتایبەتی نیشانەی (ەکە) ی ناسینو (یەك) ی تاکایەتی •

نیشانەکانی : ( ەك • یك • یەك ) لەگەڵ (ێ) ی کورتکراوەی ( یێك ) گرۆپیکن وەك :

دوژمنێك • جووتەك • دییەك • مزگەوتەك • ئوتومبێلەك • گلێنەك • دەرگایێك • کابرایەك • جوتیارێك • ڕەزێك • کریارێك • دەستەیێك • کانییەك • مێروولەیێك • سەرتاشێك • ســاڵێك • ساڵێکیان • چڵێسـیك • ڕۆژێکیان • گورگێك • کوڕێکیان • یەکێك • سێچوارێکمان • بزلەقاژوێك • بەهەشـــتانێك • بەعضەکەســـانێك • کـــورەمەلاییك • دەعبـــاییك •

چوارچێوەیێك · سێگۆشەیێك · تاقمەکوژێك · گوفتوگۆیێك · سالێ ،
بەقەد نیرەکەرێ ئەبێ · بزنێ قەڵەو · کوڕەکەچەڵێ ریوێ نەگرێ ·

٤ ـ نیشانەی کۆ :

کۆ لەدوو دانە یا زیاتر پێك‌دێ · جگە لەفرمانیش هەموو جۆرە ووشەیێك کۆ دەکرێتەوە ، بەیەکێك لەم نیشانانە :

ا ـ ( ان ) :

ئەم پیتە بۆ کۆ لەزارەکاندا بڵاوەو نیشانەی سەرەکیەتی ، وەك :
جاران ، سالاًن · بەهاران ، جوتیاران ، کرێکاران ، دوکانداران ، باوکان ، نافرەتان ، منداڵان ، قوتابیان ، ماموەستایان ، هاوڕێیان ، یەکان ، دەیان ، سەدان ، هەزاران ، داربەروان ، بنەمێوان ، هێشوەترێیان ، رستەتوتنان ، دارودرەختان ··

لەدووا ( ەکە ) ی ناسینیشەوە :

کانیەکان ، سەرچاوەکان ، درەختەکان ، کێوەکان ، پیاوەکان ، ژنەکان ، داربەڕوەکان ، گەرماوەکان ، ئاودەستەکان ، کانەبەردەکان ، رەزەترێیەکان ، کێوەبەرزەکان ، بینەرەبەرێزەکان ، گوێگرە ـ خۆشەویستەکان ، یەکەمیش : کەسانێك ، بەهەشتانیك ··

ب ـ ( ات ) بەشێوەکانیەوە کەمەو لەعەرەبیەوە داکەوتووەر وەك :
تەشکیلات ، دێهات ، میوەهات ، سەوزەوات ، حاسلاًت ، واریدات ·

ج ـ ( ەها ) شێوە فارسی‌یەو کەمیشە :

دەها ، سەدەها ، هەزارەها ، چەندەها جار ، ساڵەهای‌ساڵ ·

د ـ ( گەل ) :

ئەم نیشانە زۆرتر لەناوچەکانی سنەباوە ، وەك :

پیاوگەل ، ژنگەل ، کورگەل ، کچگەل ، نێرگەل ، مێگەل ، کەرگەل ، بەرخەگەل ، کارەگەل ، بزنەگەل ، گاگەل ، کەرەگەل ، ئەسپابگەل ··

هـ ـ ( ینه ) لەدۆخی بانگ هێشتن‌دا ، ئەگوترێ :

براینــه ، برادەرینه ، کوردینه ، هەڤالینه ، هاورێینه ، خزمینــه ، کــوڕینــه ، خوشــکینه ، پیــاوینه ، ژنینــه ، خەلکینــه ، گوێگرینه ..

هەلۆینه ، هەروەها هێندێ ووشه هەن یەکەمجار بۆچەند دانەیەك دانراون و واتایان کۆیه ، وەك :

ئێل ، خێـل ، هـۆبه ، هۆز ، تیـره ، نـەوه ، نەتـەوه ، گـەل ، کۆمـەل ، عەشـیرەت ، خــەلك ، میللــەت ، بــەره ، رەوه ، پــۆل ، چین ، کاروان ، کۆڕ ، پێر ، سوپا ، لەشکر ، لق ، تیپ ، چەپکه ، دەسته ، کورزه ، تایەفه ، تاقمه ، بەسته ، تەن ، دەرزەن ..

کۆبوونەوەی نیشانەکان :

کەنیشانەی ناساندنو کۆو خێویەتیو بکەری ، کۆبوونەوه ، بەمشێوه ریزدەکرێن :

| لەرســتەدا : | راناوی بکەری | راناوی خێری | نیشانەی کـۆ | نیشانەی ناساندن | ووشه |
|---|---|---|---|---|---|
| خانووەکانتم دیت . | م | ت | ان | ەکــه | خانــوو |
| خانووەکانمت دیت . | ت | م | ان | ەکــه | خانــوو |
| کورەکەتانم ناردەوه . | م | تان | — | ەکــه | کــوڕ |
| کورەکەمانت ناردەوه . | ت | مان | — | ەکــه | کــوڕ |

باسی پالوو ی راستەوخۆو بەیاریده :

ئیزافه ( اضافة ) بریتی‌یه لەپالدانی ووشەیێك بەووشەیێکی تـردەوه بۆ دیاری‌کردنی لایەنێکی ووشەی یەکەمیان ، ئەوسا بەووشــه دیارکــەرەکه ئەلێن « پالووی لەسـەرئەوه ئەمجۆره » پالووه دوو جۆره :

یەکەم ـ پاڵووی ڕاستەوخۆ :

هێندێك ڕێزمانی لایان وایە پاڵدانی ڕاستەوخۆ هەرچۆنێك بێ ناوی لێکدراوە ، بەڵام لەڕاستیدا هەریەك لەدوو ووشەکە واتای خۆیان هەیەو نـاوی لێکدراو ناونیـن بۆ یەکشت ، جـا پاڵـووی ڕاســـتەوخۆ لەمچەند شوێنانەدا ئەبێ :

أ ـ ڕاناوی لکاو پـاڵووی ووشــەی تــر بێ ، بـەڵام لـە شیکردنەوەدا پاشگوێئەخرێ ، چونکە ڕاناوەکە نموودی ئەوەی نیە « ناوڵناو »ی بــۆ بگوترێ ، وەك :

سەرم‌بەردە · خانووەکەمانت دیتووە · لەرێگەی‌دا بووەستە · ماڵیان ناوەدان بێ · چاوت تێك‌چوۆە · کارتان ڕاست بێ ، هەموومان هاتین ·

ب ـ ووشەی ناوی ، ئاوڵناوی ( صفة ) ڕاناوی نیشاندان ( ئەم ، ئـەو ) بێ ، وەك :

ئەم‌کوڕدت نەدیوە · ئەورەوشتەم پێ جووانە · ئەونووکە قەڵەمە سفتە · ئەم‌چنراوەیە · ئەوقژ لوولەیە · ئەوناردنـە ، ئـەوزاخاوە · ئەوشێواوەیە · ئەوهۆنراوە · لەم‌سەر ( لەئەم‌سەر ) · بەو ( بەئەو ) خوایە · بەم‌جۆرە ، ئەوشاخە ·

ج ـ جێکات‌و ژمارەو ناو ، پاڵووی یەکتری بن ، وەك :

ژوور سەرت بگەڕێ · لەکن منی دابنێ · لەگەڵ گەچدا بیگرەوە بەکۆ کەس‌دا مەچۆ · لەناو خەڵكدا · پێش بڕیاردان · پاش نان خواردن · دووا نیوەڕۆ · زۆر کەس ، کەم جار ، چەند ساڵ ئەبێ هیچ شکم نیە ، دوو میروولە ، شەش کەس · لەســەر زەوی ، لـەبن تۆ · ئەشــتووانرێ ئەم‌جۆرانە بەر ( ناوی‌لێکدراو ) بخرێن ·

دووەم ـ پاڵناوی بەیاریدەی ( ی ) :

هەمووجۆرە ووشەیێك جگە لەمزمان بەناوندی پیتی (ی) دەبێتە پاڵوو بەیەکێك لەم دوو ڕێچکەیە :

أ ـ ووشەی دووەم پەرتێك یان لایێك ·· بێ لەووشەی یەکەم ، وەك :

گەڵای درەخت · خاکی وەڵات · گەلی کورد ، قەدیچیا ، باوکی هەورام گزگلی مازوو ، جەوتی بەڕوو ، سەردانی خزم ، گەرەکی چوارباخ پێشوازی میوان · گرتنی کەلێنێك شتنی دەدان · خۆشی سالی پار ··

ب ـ ووشەی دووەم سیفەتی ووشەی یەکەم بێ ، وەك :

کتری ستێل ، جامی فافۆن · شریتی پڕ ، ئاسنی سارد ، قسەی نەستەق · خۆراکی پوخت · ماستی مەییو · قسەی ساغ · زولفی خاو گلۆپی کارەبا · بولبولی خۆش نەوا · سوخمەی ئال · رەنگی زەرد ، رێویێەکی گەڕاو ، شێرێکی هۆشیار · دەروێشێکی مارگر ··· دروستکراوی بەکەڵك · بینەری بەرێز · گوێگری هێژا ···

پالوو و نیشانەکان :

هەرچی پالووی راستەوخۆیە لەگەل نیشانەکاندا وەکو ناوی لێکدراوە پالووی بەیاریدەی (ی) یش وەکو ژێرەوەیە :

١ ـ لەگەل نیشانەی « ەکە » دا :

أ ـ ئەونیشانە دەخرێتە دووا ووشەی یەکەم ( پالەکە ) ، وەك :

کورەکەی وەستا حەمید · ماینەکەی کوێخا مەجید · هاورێیەکەی سالانت ، درەختەکانی وەلات · منداڵەکانی دێهات · هۆدەکەی نوستنت ·

ب ـ هەروەها دەخرێتە دووا ووشەی دووەم ( پالووەکە ) ، وەك :

چینی دیوارەکە ، حەوزی دێیەکە · سەرچاوەی ئاوەکە ، کانیی ناو باخەکە · زرینگەی سەعاتەکە · قەدی چیایەکە · خەڵکی دێیەکان · بەردی شاخەکان · بالە تیژەکانی ·· دەنگە نەرمەکەی · ئاوە سازگارەکەی · پەلە تووتنەکەی ·

٢ ـ نیشانەی ( ێ ، ێك ) ی تاکیەتی ، دەخرێتە :

أ ـ دووا ووشەی یەکەم ، وەك :

کاتێکی خۆش · بەدلێکی شاد · گەلێکی کۆن · وەلاتێکی شاخاوی · کابرایێکی دەولەمەند · پیاوێکی بەسامان · گەشتێکی سەرچنار چیایێکی بلیند · سەعاتێکی سەرمێز · تاکسیەکی لادا · رێوێێکی فێلباز ·

ب ـ دەخرێتە دووا ووشەی دووەم ، وەك :

مەڕی ئاغایێك ، دەنکە جۆیەك · هاوڕێی سالێك · قەراخی چەمێك · هاوسەری چلسالێکم · خەیاڵی سەفەرێکم هەیە ·

وورد بوونەوەیێك :

لەبەر پیتی « ە » ش بەلامەوە هویێکی پاڵدان ( ئیزافە ) بوو کاتێك پاڵووەکە ناسراوی ( ەکە )و ( ئەم ، ئەو ) بێ ، وەکو : پەتووە نەرمەکە ، یا ئەم پەتووە نەرمی هیمن نیە · بەڵام بۆ ریکخستنی باری رێزمانەکە ، باش وایە پیتی « ە » لەهەموو دۆخێکدا لەگەل جووت ووشەدا ، ناوی لێکدراو پێك بهێنێ ، لەبەر ئەوە لەمەوپێش نموونەی : ئەمگولە زەردەیەو هاوینە هەوارکە ··· مان بۆ ناوی لێکدراو بەناوندی « ە » هێناوەتەوە ·

خستنەگەل ( العطف ) ، یان پالووی بەیاریدەی (و) :

هەموو جۆرە ووشەیێك بەهۆی پیتی (و) دەخرێتە گەل یەکتر وەك : حەمەو مەحموود · ئازادو نەوزاد · بەیانیو ئێوارە · سەرو ماڵ نەدارو ساماندار · ئاشەوانو شاگردەکەی · میرو بەردەستەکانی نالیو وەفایی · کورسیو مێز · پاشو پێش · خواردنو نوستن · چوونو هاتنەوە ·

ناوی رەگەلخراوو نیشانە :

نیشانەکان دەچنە دووا ناوەکەو پالووەکەشی وەکو ژێرەوەو :

١ ـ ( ەکە ) :

کورسیو میزەکە ، کورسیەکەو میزەکە ، بازارو کۆلانەکە ، بازارەکەو کولانەکە ·

٢ ـ (ێك ) :

کورسیو میزێك · کورسییەکو مێزێك · بازارو کۆلانێك · کۆلانێکو بازارێك ··

٣ ـ ( ان ) :

کورسیو مێزان · کورسییانو مێزان ، بازارو کۆلانان · بازارانو کۆلانان بەتێکەلیش :

کورسی‌و میزه‌کان ، کورسییه‌کان‌و مێزه‌کان . کورسییه‌که‌و مێزێك . کورسییه‌که‌و مێزان ، کورسییه‌که‌و مێزه‌کان . بازاره‌که‌و کۆڵانێك بازارێك‌و کۆڵانه‌که . بازارێك‌و کۆڵانه‌کان ...

**ئه‌شتووانین زاراوه‌ی ( پاڵووی به‌یاریده‌ی ) « و » بۆ به‌کار بهێنین . به‌دووا یه‌ك داهاتنی پاڵوو ( مضاف الیه ) :**

هه‌ردوو جۆره پاڵووه‌کان به‌دووا خۆیان‌و به‌دووا یه‌کتری‌دا دێن . وه‌ك :

ئه‌وهه‌موو به‌رده وورده‌و درشـــتانه‌ی ناو خـــڕو چه‌م‌و رووبـاره‌کان ئه‌وبه‌رهه‌مه زۆرو باشه‌ی کشتوکاڵی ئه‌مساڵ . شـنه‌ی سـێبه‌ری داری گوێزو توو ده‌سری ئاره‌قی رێبواری ماندوو .. باڵه‌ی خوا مرادی دۆڵی بناوێنی . گه‌شتێکی هاوینه هه‌واری دۆڵی هورمێ ئاوه سارده‌که‌ی سه‌رچاوه‌ی زه‌ڵم . ماسی ی گۆمه شینه‌که‌ی سه‌راوی سوبحاناغا .

## به‌سه‌ر گرتنه‌وه‌یێك له‌سێ به‌ش‌دا :

به‌شی‌یه‌که‌م ـ ناو :

أ ـ ناو له‌رووی ناوه‌رۆکه‌وه سێ‌جۆره :

١ ـ ناوی تایبه‌تی ( ناسناو ) وه‌کو :

نه‌سرین . شێرکۆ . بێستوون . قه‌ندیل . سیروان . تانجه‌رۆ ..

٢ ـ ناوی ئاسایی ، وه‌کو :

دایك . کچ . ژن . باوك . کوڕ . مامۆسـتا . شـێر . بـه‌رد . گڵ . ئـاو ..

٣ ـ ناوی کومه‌ڵ ( کۆناو ـ اسم الجمع ) . وه‌ك : گه‌ل . میلله‌ت . هۆبه . خێڵ .. رابراوه .

ب ـ ناو له‌رووی هه‌بوونه‌وه دوو جۆره :

١ ـ ناوی ماددی ( به‌رجه‌سته ) . وه‌ك :

که‌و . دار . گوڵ . ئاسمان . زه‌وی . مێش . گیا . ئاسۆ . ده‌نگ . بـــا .

٢ ـ ناوی واتایی ( بێ‌جەستە ) ٠ وەك :

خەم ٠ بڕوا ٠ هێز ٠ شەرم ٠ ترس ٠ هۆش ٠ یاد ٠ بیر ٠ کەیف ٠٠ حەز ٠٠

بەڵام بەشی هەرە زۆریان بەهۆی نیشانەی ( ی ، ەتی ، ایی ، ایەتی ) وەیە ، وەك :

منداڵی ٠ پیاوەتی ٠ ڕاستایەتی ٠ جوانی ٠ بەرزایی ٠٠٠

لەمەش دابڕاوە ٠

ج ـ ناو لەڕووی پێکهاتنەوە : ( ساکار ، دارژاو ٠ داتاش ٠ لێکدراو ) باسمان کردووە ٠

د ـ ناو لەڕووی توخمەوە سێ جۆرە :

جۆری یەکەم ـ ناوی مرۆڤ :

مرۆڤ لێرەدا یاسی سێ باری هەیە :

١ ـ خۆناو ( ناسناو )ی تایبەت بەنێر یا بەمێ ، وەك :

سمکۆ ٠ هیوا ٠ کامەران ٠ بەختیار ٠ نەوزاد ٠ هێمن ٠ هۆشیار ٠ ئاراز ٠ سروە ٠ ژیان ٠ لەنجە ٠ گوڵناز ٠ گەلاوێژ ٠ شریفە ٠ گوڵبەر ٠ شاناز ٠٠

٢ ـ نازناوی ( لقب ) تایبەت بەنێر یا بەمێ ، وەك :

باوك ٠ باپیر ٠ مام ٠ خاڵ ٠ برا ٠ کوڕ ٠ زاوا ٠ مێرد ٠ هوور ٠ خەزوورر ٠ مێر پیاو ٠ دایك ٠ نەنك ٠ بوور ٠ میمك ٠ کچ ٠ خوشك ٠ بووك ٠ خەسوو ٠ ژن ٠ ئافرەت ٠

٣ ـ هەندێ پایەو پیشەی تایبەت بەهەردوو لا ، وەك :

خەلیفە ٠ سوڵتان ٠ پاشا ٠ وەزیر ٠ میرخان ٠ فەرماندە ٠ شارەوان ٠ پارێزگار ٠٠ ئاغا ٠ بەگ ٠ مەلا ٠ پۆلیس ٠ سەرباز ٠ ئاسنگەر ٠ باخەوان ٠ ڕاوچی ٠ پاسەوان ٠ پینەچی ٠٠٠ لە ڕاستیشدا ئەگەر ئافرەت لەم جۆرە پایەو هونەرانەی هەبوایە ناوەکانی بۆ

بەکار دەهات ، بەیەکسانی ، بۆ ڕێزیش دەگوترێ :

کالدووریا ، هەڤاڵسەدار ، هاورێ .. جەناب .. قوربان .. هەربەو جۆرەش بۆمێ :

کابان ، دایەن ، کەیبانوو ، چێشتکەر ، نانکەر ، تەونچی ، جلشۆر .. بۆ ڕێزیشیان :

دادەبەناز ، خوشکەهێرۆ ، باجیمینا ، قومریخان ، خاتوشنەست گولناز ، دایەپەروین ، خانمگیان ، مەلاژن ، ماموەستاژن ..

٤ ـ پیشەو کارو هونەری یەکسان :

نێرو مێی مرۆڤ لەبەشی هەرەزۆری پیشەو هونەر وئیشو کاردا ناوی یەکسانیان بۆ بەکاردێ وەك :

کرێکار ، جوتیار ، کڕیار ، فرۆشیار ، ماڵدار ، دڵدار ، دوکاندار ، ساماندار، حەیواندار ، کارگوزار ، دانەر ، نوسەر ، داهێنەر ، وەستا شاگرد ، قوتابی ، ماموەستا ، بەختیار ، هونەرمەند ، خزمەتچی ، توتنەوان بەڕێوەبەر ، چاودێر ، رابەر ، بەردەست ، بەرگدروو ، گۆرانیبێژ ، بوێژ ، چالاك ، دروستکەر ، پزیشك ، هەڵکەوتوو ، زانا ..

جۆری دووەم ـ ناوی گیاندار :

گیاندار ناسناوی کەمە ، وەك ئەوەی سەگێك یا هەر گیاندارێك بەنموونەی « شێلە ، قوتە ، حەپۆك .. » ناوبنرێ ، لەبەرئەوە ناوی گیاندار لەرووی توخمەوە دوو باری هەیە :

١ ـ ئاوڵناوی تایبەت بەنێرەو مێیەی گیاندار ، وەك :

گا ، ئەسپ ، یەکانە ، نێری ، بەران ، کەڵەشێر ، سۆنە !.

مانگا ، ماین ، ماڵۆس ، مەڕ ، بزن ، مریشك ... ئەمجۆرە زۆر کەمە .

٢ ـ ئاوڵناوی یەکسان بۆنێرەو مێیە ، وەك :

قاز ، مراوی ، چوێلەکە ، کەو ، هەڵۆ ، کەر ، ئێستر ،

سەگ ، پشیلە ، گورگ ، ریوی ، بەراز ، شێر ، دەلەك ، پلینگ ، وورچ ، کەمتیار ، چەقەل لەمانە چی گیانداری وورده ( جرو جانەوەر ) وەکو :

قالونچە ، میروولە ، سێسرە ، مێش ، مار ، بۆق ، قرژال ، کرم ، ملە ..

باری نێرو مێیەتیان پاش گوێ خراوە ، چی درشتیشە کاتێ ویسترا ناوی نێرەو مێیەیان جیا بێ ووشەی نێر ، نەڕ ، کەڵ ، کۆڵ ، مێ ) لەگەڵ ناوی نیرچکەیان ، هەروا ووشەی ( مێ ، ما ، مادە ، ماچە ، دێل ) لەگەڵ ناوی مێچکەیان لە شێوەی ناوی لێکدراودا بەکاردێ ، وەك :

نیرەکەر ، نەڕەدیو ، وورچەنێر ، جووانەگا ، کەڵەگا ، کەڵگامیش ، گۆلە سەگ گۆلەریوی .. ماکەر ، ماکەو ، کۆترەمێ ، شەکەمێ ، ئێسترەماچە دێلە کەمتیار ، دێلەشێرو گۆلەشێر ..

جۆری سێیەم ـ ناوی بێگیان ـ گیان‌نەدار ـ وەك :

شاخ ، دەشت ، رۆژ ، شەو ، خۆر ، مانگ ، زەوی ، ئاسمان هەور ، باران ، پووش ، گیا ، درەخت ، تەماتە ، بامیە ، سێو ، هەنار ، ترێ ، مێو ، گلەیی ، تووانج ، دەست ، چاو ، رەق قوڕ ..

ئەمانە چونکە لەبارێکی راستەقینەدا نە نێرنو نەمێن ناوی یەکسانیان بۆ بەکاردێ وەك : « بەرد » نەنێرەو نەمێ .. هەروەها هەموو ناوی شتی بێگیان چی ناوبراون‌و چی ناونەبراون .

جا رەنگە بلێیت : ئەی ئەوەنیە کرمانجیژووروو وسەروو لەدۆخی ئیزافەدا ( ی ، ێ ) بۆنێرو ( ە ، ا ) بۆمێ ، بۆکۆشیان ( ێت ، ێن ) بەکاردێ‌و دەڵێن :

کوڕێ‌بۆزۆ ، کەچاشیرۆ ، گایێ بارام ، چیلەکاشیرین ، هوزانێن وەلاتێدەخۆی بەفراسیی ، خەنجەرامن ، چێشتاتێ ، پیتێ بێدەنگ ،

لخوندگەهێ دخوینی ؟!! لەوەلامدا ئەلێم : ئەونیشانانە بۆ پاڵدانن . نەك بۆ جیاکردنەوەی نێرو مێ ی ناراستەقینە . چونکە ئەگەر لەشوێن ـ بۆنموونە :

( دێوانا یەکەم ) بلێین : ( دێوانی یەکەم ) یا لەبری ( گوتنێ پێشینان ) بگوترێ :

( گوتنا پێشینان ) هیچ فەرق ناکاو بەهەڵەش دانانرێ ..

بەشیدووەم ـ ئاوڵناو ( صیفەت ) :

لەبەراییدا گوتمان : ئاوڵناو سێ جۆرە : ( رەبەق . سەربەخۆ . راستەوخۆ ، بەیاریدەی «ی» بەڵام لێرەدا بەشێوەیکی گشتی نموونە بۆ دۆخی سادەییو دارڕاویو داتاشیو لێکدراوی دەهێنینەوە :

نموونەی ئاوڵناوی سادە، وەکو :

کورت . درێژ . تەسك . پان . تەنگ . قوول . راست . خووار . چاڵ کەچ . رەق . شل . نەرم . توند . خەست . ناسك . تورت . چیر . تفت . شیرین . ترش . تاڵ . مزر . شۆر . جوان . دەلال . گران . سووك . زۆر . کەم . تەنك . قایم . ئەستوور . باریك . پاك . قرێژ . گەرم . سارد . تەڕ . ووشك. وورد . درشت . زل . مەزن . گەورە. بچووك . لووس . سفت زبر . بەرز . بڵند . نزم . نەوی . گەش . سیس . تازە . کۆن . نووێ . چەوت . پیس . چاك . خەراپ . باش . خۆش . تیژ . چوست . سست . رەش . سپی . شین . سوور . زەرد . کەسك . سەوز . مۆر . قرمز . بۆر . تژی . پڕ . بۆش . بەتاڵ . ئاسان قورس . زرینگ . زیرەك . دوور . نیزیك . دارڕاویش وەکو : زەردێنە . رووناك . گەرما . دێرین . رابراوە . داتاشیش وەکو : رەقەن . رەشکەلە . ئاسنگەر . چوتیار . بەختیار .

ـبڕوانە ناوی داتاشراو ، بەشێکیان لەم جۆرەن ـ

بۆ لێکدراویش پێویستە لەگەڵ ووشەیەکی ناویدا بێ وەکو :

سەرخۆش · سەرخر · دڵپاك · كە لەباسی ( ناوی لێكدراودا ) گوزەشت ·

ئەمانە پلەی چەسپاون · بۆ پلەی بەراوردیش پاشبەندی ( تر ) ی دەخرێتە دووا : چەوتتر · باشتر · زەیرەكتر ··· بۆ پلەی باڵاش پاشگری ( ترین ) وەك : گەورەترین · رەشترین · دوورترین ··

زانرویشە : ووشەی ( تر ) و ( دی ) وەك جۆرە سیفەتێك بەیەكسانی لەشوونی یەكتری بەكاردێن : ساڵێكی دی · جارێكی‌تر · روژێكی دی شەوێكی تر · كورێكی دی پیاوێكی تر · دەشكوترێ :

جارێكی دیكە · باسێكی دیكە ·· بەڵام خەڵكی سلیمانی هەر ( كە ) پەكەی لێ ئەهێڵنەوەو دەڵێن :

هەڵێكی‌كە · ناوێكی‌كە · نەخشێكی‌كە · كەمێكی‌كە · برێكی‌كە ···

هەروەها ووشەی ( وا ، وەها ، ئاوها ) سیفەتن : چەند ساڵی وا ، چەند كەسی ئاوا ، چەند برادەری وەها ، چەند رەفیقی ئاوها ··

## بەشی سێیەم ــ ژمارە :

ژمارە لەرووێكی گشتییەوە دوو جۆرە :

جۆری یەكەم ــ ژمارەی بنجی

ژمارەی بنجی پێك‌هاتووە لە :

١ ــ ژمارەی سادە :

لەیەكەوە تا دەش ، لەگەڵ : بیست · سی · چل · سەد · هەزار ملوێن ·

٢ ــ ژمارەی دارژاو : پەنجا · شەست · حەفتا · هەشتا · نەوەد ·

٣ ــ ژمارەی لێكدراو : كە ئەمانەن : (٢٠٠) تا (٩٠٠) ، هەروا : (٢٠٠٠) تا نۆهەزار ،(١١) هەزار تا (١٩٠٠٠)، بیست‌هەزار تا (٩٠٠٠٠)، دووسەدهەزار تا (٩٠٠٠٠٠) هەر بەو جۆرەش یەكان‌و دەیان‌و سەدانی ملوێنان ·

٤ ــ ژمارەی بەستراو بەیەكەوە بەهۆی (و) ، وەك :

بیست‌ویەك تا بیست‌ونۆش ، ٣١ ــ ٣٩ ، چل‌ویەك تا ٤٩ ش هەروا

بـرۆ : ٥١ ، ٥٢ ، ٦١ ، ٦٨ ، ٧١ ، ٧٤ ، ٧٩ ، ٨١ ، ٨٣ ، ٩١ ـ ٩٩ سەدویەك · ( ١٠٢ ـ ١٠٩ ) ، سەدسێزدە ، سەدوبیستو نۆ ···

تێبینی :

١ ـ ئەو ناوەی دەکەوێتە دوا ژمارەکە پالوی راستەو خۆیە وەك : شازدە · موبەریدە · سەدو پەنجا دینار چلو هەشت کەس ·

٢ ـ ئەوناوەی دەکەوێتە دوا پێژەر ، یا ژمێرەر ، پاکێشورەکە کە بـە ( جیاکەرەوە ) دائەنرێ وەك : هەژدە گلۆز جگەرە دووسەد دانـە موشاربر ، نۆسەد کیسە چیمەنتو ، بیست دەرزەن بزمـار ·

## ژمارەی بنجیو نیشانەکانی :

١ ـ ( اه ، ەها ) ی کۆ : لەمەو پێش باس کراوە ·

٢ ـ ( ەکە ) ی ناسین : بەلام بەزۆری دەچێتە پال ئاولی ژمارەکە ، وەك : چوارسەدەکە · چوارنەفەرەکان · سێخانووەکە · سێژوورەکە ··

٣ ـ ( یلە ) ی تاکیەتی ، وەك :

دوسێیێك · سێچوارێك · دەبانزەیێك · چەندسەدێك دەبن ··

٤ ـ ( ەم ، ەمین ، هەم ، هەمین ) · بـۆ پلەی بەراورد ( ئەم )و بۆ پلەی بالان ( مین )ی ، لەگـەل دەخرێ ، وەك : دووەم ، هەشـتەم ، چواردەهەم ، یەکەمین · سێیەمین · سێزدەهەم کەس · یەکەم ، سێیەم · سەدەهەم بیستوشەشەم · رێککەوتنی چلو هەشتەم ··

جۆری دووەم ـ ژمارەی کەرتی :

ژمارەی کەرتی دوو شێوەی هەیە :

١ ـ کەرتی ئاسایی :

ئەم کەرتە بۆ یەلە پەرت بەلێکدانی ووشەی (یەك) پێك دێ لەژمارەکانیان، بەپێچەوانەوە بەلێکدەرو لێکدراو دەگوترێ ( سـەرە ) و ( ژێـرە ) وەك :

٢/١ یەلەلەدوو ( نیوە ) ، ٣/١ یەك لەسێ ( سێیەك ) ، ٤٠/١ ( چلیەك )

بۆ زیاتر لـەپەرتێکیش چەندت بوێت ئەوەندە ئەخەیتە شـوێنی ووشـەی ( یەك ) و دەلێیت : ٣/٢ دوو لەسێ ، ١٨/٥ پێنج لەسەر هەژدە ··

٢ ـ كەرتی دەیی :

مەبەست کەرتی دەیی‌و کەرتی سەدی‌و کەرتی هەزاری‌یە ••• هتد

کەرتی دەیی بەم شێوە دەنووسرێ‌و دەخوێنرێتەوە :

١و٠ سفر ژمارەی تەواوو لە دەدا یەك ، ٨و٢ دوو ژمارەی تەواوو لەدەدا هەشت ، ٧٥و١٥ پازدە ژمارەی تەواوو لەسەددا حەفتاوپێنج ١٨و٨٣ هەژدەو لەسەددا هەشتاوسێ •

٢٥ر٧٥٠ بیست‌وپێنج ژمارەی تەواوو لەهەزاردا حەوتسەدو پەنجا •

١٣٨ر٨٥٠ سەدو سی‌وهەشت‌و لەهەزاردا هەشتسەدو پەنجا •

ڕێژەی سەدیش :

١٪ لەسەدایەك ، ٨٥٪ لەسەدا هەشتاوپێنج ، ٩٩٪ لەسەدا نەوەدونۆ

ئەم چەند خاڵانە سەر بەبیرکاری‌یەو ئێرە شووێنی نیە ، چونکە ژمارە لەبیرکاری‌دا زانستێکی ناسراوی سەربەخۆی گرنگەو لەهەموو قۆناغەکان‌دا لەگەڵ زانستی ئەندازەدا دەخوێنرێن :

دەرگای سێیەم ووشەی فرمانی :

ووشەی فرمانی پێنج بەربەشی هەیە : ( چاوگ ئاولکەر • ئاولکارا • ئاولکراو ، فرمان ) وەکو بەریز دێن :

چەشنی یەکەم ـ چاوگ ( المصدر ) :

چاوگ بریتین لەو ووشە فرمانیانەی کۆتابیان بەیەکێك لە :

( ان • ین • وون • تن • دن ) هاتووە •

ئەوچاوگانە سێ باریان هەیە ، وەکو باس دەکرێن :

جۆری یەکەم ـ چاوگی سادە :

چاوگی سادە ئەو ووشە فرمانیانەن هیچ پێشگرو پاشگریان پێوە نەبێ ، وەك : چوون • گێران • برین • ناردن • کەوتن ••

جۆری دووەم ـ چاوگی دارژاو :

ئەم پێشگرانە : ( هەڵ • دا • ڕا • پێ • تێ • لێ • پێك • تێك • لێك • پێوە • تێوە • پێدا • تێدا • پێرا • پێهەڵ • تێهەڵ • فە • وە •

رۆ · ڕێ · وەر · لا ·· ) لەگەڵ پاشگری ( ەوە ) دا چاوگە سادەکان نەکەن بە چاوگی دارژاو ، وەك : هەڵچوون · داگیران · تێبرین · تێهەڵکەوتن ·· ئێمە ئەم دوو جورە بەیەکەوە ئەنوسین ·

جوری یەکەم و دووەم ـ چاوگی سادەو دارژاو :

أ ـ لەچاوگی ( ان ) دار :

ئایسان · هەڵایسان · ئاوسان · ئاڵۆزان · ئێشان · ئالان · ئاژوان · بڕان · هەڵبڕان · بڕانەوە · بوورانەوە · برژان · برژانەوە · بریقانەوە · بریسکانەوە · پووان · پێچان · هەڵپێچان · پێچانەوە · پاچین · هەڵپاچین · داپاچین · پچڕان · هەڵپچڕان · پچڕانەوە · پاڕانەوە · پڕوان · هەڵپڕوان · پڕووزان · پرزان · پسان · هەڵپسان · پسانەوە · پرژان · پیشان · تووانەوە · تاسان · تۆران · ترسان · ترازان · تکان · جوولان · جوولانەوە · جمان · چزان · چزانەوە · چۆڕانەوە · چریسکانەوە · چرقان · هەڵچرقان · چەوسانەوە · حەوانەوە · حەسانەوە · خووسان · خووسانەوە · خشان · لێخشان · خولانەوە · هەڵخەڵەتان · خوران · دان · هەڵدان · دادان · لادان · بادان · لێدان · لیکدان · ویدان · تێڕادان · تێوەردان · تێهەڵدان · دانەوە · هەڵدانەوە · دادانەوە · لیکدانەوە · دڕان · هەڵدڕان · دۆڕان · دزان ـ خۆشنەویستن ـ دێران ـ جۆشان · درەوشانەوە · دووان · دوواندن · ڕو وان · ڕووانەوە · ڕازانەوە · ڕژان · هەڵڕژان · داڕژان · ڕشان ؟ ڕشانەوە · ڕووشان · ڕمان · ڕوخان · زان · زڕان · زورانەوە · سووڕان · هەڵسوڕان · سووڕانەوە · سازان · سانەوە · ژیان · ژیانەوە · ژان · ژاکان · سووتان · شیان · شێوان · شێلان · شکان · شکانەوە · شلقان · فریوان · هەڵفریوان · قپان · قرتان · سووتان · فەوتان · قلێشان · کڕان · کڕانەوە · کزانەوە · کشان · ڕاکشان · کشانەوە · سوتانەوە · کێشان · هەڵکێشان · داکێشان · ڕاکیشان · هەڵکێشانەوە · کۆشان · تێکوشان · کولان · کێلان · کێلانەوە · کولانەنەوە · گان · گووان · گەشانەوە · گەڕان · هەڵگەڕان · گران · هەڵگران · لێگەڕان · تێگەڕان · گەڕانەوە ·

هەلکەڕانەوە ٠ گۆڕان ٠ گێڕان ٠ گێڕانەوە ٠ گریان ٠ گونجان ٠ گیرسان ٠
داگیرسان ٠ گیرسانەوە ٠ لوران ٠ لکان ٠ لان ( بلێ مەلێ ) لەرانەوە ٠
لەوەڕان ٠ مان ٠ دامان ٠ تێرامان ٠ مانەوە ٠ مۆڵان ٠
دامەزران ٠ نان ٠ هەلنان ٠ دانان ٠ لێنان ٠ تێنان ٠ لێکنان ٠ پێوەنان ٠
نانەوە ٠ داناوە هەلنانەوە ٠ نووسان ٠ پێوەنووسان ٠ نووان ٠ ڕانواندن
نوشتانەوە ٠ هێنان ٠ هەلهێنان ٠ داهێنان ٠ ڕاهێنان ٠ هێنانەوە ٠
داهێنانەوە ٠ وێران ٠ پێوێران ٠ وەستان ٠ داوەستان ٠ ڕاوەستان ٠
وەستانەوە ٠ هەلوەشان :

چاوگی ( ون ـ ین ) دار :

بوون ٠ هەلبوون ٠ پێوەبوون ٠ رابوون ٠ چوون ٠ هەلچوون ٠
دەرچوون ٠ پێکچوون ٠ تێکچوون ٠ لاچووە ٠ پێداچووە ٠ تێراچووە ٠
تێهەلچوون ٠ ڕۆچوون ٠ چوونەوە ٠ تێهەلچوونەوە ٠ پێداچوونەوە ٠
ئاخنین ٠ هەلاخنین ٠ برین ٠ هەلبرین ٠ دابرین ٠ برینەوە ٠ باسین ٠
داباڕین ٠ بووڕین ٠ بوژین ٠ بەخشین ٠ بەزین ٠ دابەزین ٠ هەلبەزینەوە ٠
بینین ٠ بینینەوە ٠ بچڕین ٠ هەلبچڕین ٠ دابچڕین ٠ بچڕینەوە ٠ بەڕین ٠
هەلپەڕین ٠ ڕابەڕین ٠ تێپەڕین ٠ بەڕینەوە ٠ پرسین ٠ لێپرسینەوە ٠
پرژین ٠ هەلپرژین ٠ پۆشین ٠ داپۆشین ٠ پەرانین ٠ تەنین ٠ تەنینەوە ٠
تەپین ٠ تۆپین ٠ تەزین ٠ تاشین ٠ داتاشین ٠ تەقین ٠ هەلتەقین ٠
تەقینەوە ٠ هەلتۆقین . تەکینەوە ٠ جووین ٠ جووینەوە ٠ جنین ٠ هەلجنین ٠
چنین ٠ هەلچنین ٠ چنینەوە ٠ چەمینەوە ٠ ڕاچەنین ٠ چەقین ٠ تێهەلچەقین ٠
خەسین ٠ خزین ٠ داخزین ٠ دڕین ٠ هەلدڕین ٠ دادڕین ٠ دروین ٠
دوورین ٠ دروینەوە ٠ دوورینەوە ٠ دزین ٠ دزینەوە ٠ دۆزین ٠ دۆزینەوە ٠
دەمین ٠ دۆشین ٠ ڕۆیین ٠ ڕەوینەوە ٠ ڕنین ٠ دارنین ٠ ڕنینەوە ٠
ڕزین ٠ داڕزین ٠ سووین ٠ سووینەوە ٠ سڕین ٠ سڕینەوە ٠ سەپین .
سەپاندن ٠ زانین ٠ ژین ٠ ژینەوە ٠ ژەنین ٠ دازەنین ٠ شەقین ٠ فڕین ٠

هەلفرین · قەلشین · قولین · هەلقولین · کرین · کرینەوە · کولین ·
کۆلین · هەلکولین · لێکولینەوە · گەیین · پێراگەیین · گوشین ·
راگوشین · گەزین · گەوزین · گۆزین · گۆزینەوە · گەنین ·
لەرزین · هەللەرزین · لەقین · مالین · مەیین · مزین · هەلمزین · نووسین ·
نووسینەوە · ناسین · ناسینەوە · نازین · نالین · وەرین · هەلوەرین ·
وەشین · داوەشین · کەنین · پێکەنین · هارین ·
چاوگی ( تن ) دار :

ئاژاوتن · ئاخاتن · بێژتن · دابێژتن · بێژتنەوە · بزوتن ·
بزووتنەوە · بزاوتن · بزاوتنەوە · بزارتن · هەلبزارتن · بەستن ·
هەلبەستن · دابەستن · بەستنەوە · بیستن · بیستنەوە · پەستن ·
پەستنەوە · پەرستن · پاراستن · پشلوتن · پشکووتن · بالاوتن · چێشتن ·
خەوتن · خستن · هەلخستن · داخستن · راخستن · خستنەوە ·
خواستن · داخوازتن · داشتن · هەلداشتن · رستن · رستنەوە · رشتن ·
هەلرشتن · دارشتن · رۆیشتن · رۆیشتنەوە · شتن · شتنەوە ·
ژنەوتن · قەلاشتن · قەلاشتنەوە · قۆستنەوە · کەوتن · هەلکەوتن ·
داکەوتن · ریکەوتن · لاکەوتن · تێکەوتن · تیهەلکەوتن · گوتن · پێکوتن ·
کوتنەوە · پێکوتنەوە ·

کوژتن · گەیشتن · پێگەیشتن · تێگەیشتن · گەیشتنەوە · گەزتن ·
گرتن · هەلگرتن · داگرتن · راگرتن · پێگرتن · پێك گرتن · تێگرتن ·
گرتنەوە · هەلگرتنەوە · گوواستن · گواستنەوە · دانیشتن · ناشتن ·
ریناشتن · میزتن · هەلیزتن · نیشتن · هەلنیشتن · دادیشتن · ناشتن ·
ناشتنەوە · نوستن · نوستنەوە · هاتن · هەلهاتن · داهاتن · راهاتن · پیداهاتن ·
پێراهاتن · پێك هاتن · تیهەلهاتن · هاتنەوە · راهاتنەوە · هێشتن ·
داهیشتن · هێشتنەوە · هاویشتن · هەلهاویشتن · ووتن · ووتنەوە ·
چاوگی ( دن ) دار :

بردن ، ڕابردن ، لابـردن ، بردنـەوە ، بـواردن ، هەڵبـواردن ، ڕابواردن ، چاندن ، داچانـدن ، چانـدنەوە ، خـواردن ، خواردنەوە ، خایاندن ، خوێنـدن ، خوێندنەوە ، دەڵانـدن ، سـەندن ، لێسەندن ، ساندنەوە ، ستاندن ، ستاندنەوە ، سپاردن ، ڕاسپاردن ، هەڵسەنگاندن ، شاردنەوە ، ژماردن ، ژماردنەوە ، قەبلاندن ، هەڵقەندن ، هەڵکەندن ، داکەندن ، کردن ، هەڵکردن ، ڕاکردن ، ڕۆکردن ، لێکردن ، تێکردن ، پێوەکردن ، کردنەوە ، لێکردنەوە ، تێککردنـەوە ، مـردن ، دامـردن ، ناردن ، ، ناردنەوە ...

## جۆری سێهەم چاوگی لێکدراو

هێندێ چاوگ بەلێکدان لەگەڵ هێندێ ووشە ناوی تایبـەتی واتایان تەواو ئەبێت . بەشی گرنگیان دەخەینە ڕوو بەدوو ڕێوچگە :

یەکەم ـ ووشە × چاوگ لەم چەند خاڵانەدا :

ا ـ لەگەڵ چاوگی ( بوون ) دا :

گەورەبوون ، بزربوون ، ئاوا ـ پەیدا ـ باش ـ پان ـ پتر ـ پڕ ـ توند ، تەڕ ـ ترش ـ تەواو ـ جوان ـ چاك ـ چەور ـ حاڵی ـ خاڵی ـ خۆش ـ خڕ ـ ڕەق ـ دروست ـ ڕیز ـ زەرد ـ زۆر ـ زیاد ـ سەوز ـ سارد ـ سوار ـ سووك ـ ساز ـ شل ـ فێر ـ قەڵس ـ کز ـ کون ـ کاس ـ گەرم ـ گوم ـ وورد ـ لووس ـ دەر ـ بەر ـ تووش .

ب ـ لەگەڵ ( بوونەوە ) داوەك : خڕبوونەوە ...

کۆ ـ گرد ـ گەرم ـ سارد ـ نەرم ـ شل ـ ئاشت ـ پڕ ـ ژیـر ـ نووێ ـ تازە ـ ڕوون ـ خەبەر ـ ڕاست ـ خوار ـ نیزیك ـ جیا ـ گەش ـ پاك ـ خاوێن ـ خەبەر ـ خاو ـ سوور ـ ساغ ـ بەر .

ج ـ لەگەڵ چاوگی ( کردن )دا ، وەك : ئاوکردن ..

ئاوا ـ با ـ بار ـ بزر ـ بـۆن ـ بانگ ـ پان ـ پەیدا ـ خۆش ـ تۆقە ـ هتـد ..

د ـ لەگەڵ چاوگی کردنەوەدا ، وەك : گردکردنەوە ..

کۆکردنەوە ـ خڕ ـ نوێ ـ چاو ـ روون ـ ساغ ـ دەور ... ـ هتد ..

هـ ـ لەگەڵ چاوگی ( گرتن ، گرتنەوە ) دابلێ :

ئارامگرتن ـ ڕێز ـ قەدر ـ خۆ ـ بەر ـ گوێ ـ خاتر ـ دل ـ بار ـ دەق ـ دەست .

جی ـ دەور ـ سەر ـ گرێ ـ وێنە ـ لایەن ـ کەلك ـ بێزو ـیەك ـ پشت .. هەربەوجۆرەش : قسەگرتنەوە ـ خۆ ـ وێنە ـ ڕەنگ ـ خوو ـ دەست ...

و ـ لەگەڵ چاوگی ( دان ) دا :

ئاودان . ئەنجامدان ـ ئازار ـ بۆڕ ـ بڕیار ـ باز ـ بەر ـ بەیانی ـ تووڕ ـ تاو ـ تل ـ تەفرە ـ پشوو ـ بەلێن ـ بانگ ـپەنا ـ پێشمان ـ پەلە ـ جەب ـ جنێو ـ جار ـ جۆش ـ دڕ ـ دەم ـ دەنگ ـدیاری ـ دەر ـ ڕوو ـ ڕێ ـ ڕێگە ـ سووڕ ـ سەر ـ سوێند ـ سەرسم ـ فوو ـ فڕێ ـ فووت ـ قاو ـ کۆل ـ کول ـ گڕ ـ گرێ ـ گەلە ـ گەسك ـ ماوە ـ ئاوڕ . .

هەربەوجۆرەش :

بادانەوە ، بەردانەوە ـ دل ـ ڕەنگ ـ خێر ـ وەرد ـ دەنگ ـ شۆق ـ تێشك ـ قەرز ـ سلاو ـ وەلام ـ جوواب ـ سەررا ـ گل ـ پال ..

ز ـ لەگەڵ چاوگی ( کەوتن و خستن ) :

دەستکەوتن ، سەرکەوتن ، دەرکەوتن ، پیشخستن ـ پاش ـ دووا ـ پال ـ ڕێك ـ یەك ـ فریا ـ ناوك ـ پەك ـ چاوپێکەوتن ـ بیرکەوتنە ، یادخستنەوە . دوور ـ نیزیك ـ بەراست ـ بەدرۆ ...

ح ـ لەگەڵ چاوگی ( هاتن و هێنان ) دا :

دەرهێنان ـ روو ـ ناو ـ دەست ـ کۆتایی ـ واز ـ بەخەبەرهاتن ـ بەکار ـ ژن ـ سەرە ـ گەرم ـ دووایی ـ بیرهاتنەوە ، بیرهێنانەوە .

ط ـ لەگەل چاوگی ( خواردن ، خواردنەوە ) :

زۆرخواردن ـ تیر ـ سوێند ـ بلر ـ جۆش ـ نان ـ سوو ـ خەفەت ..

ئاوخواردنەوە ـ چا ـ قسە ! ـ پێش ـ رق .

ی ـ لەگەل ( چوون ) دا :

لەبیر چوون ـ لەچاو ـ لەیاد ـ لەکیس ـ لەخۆ ـ لەناو ـ لەسەر ـ لەبەر .

ک ـ لەگەل چاوگی ( بردن ) دا :

ناوبردن ـ هەڵبردن ـ گومان ـ هاک ـ پەنا ـ مێشک ـ رۆ ـ بەڕێوە ـ

دەر ـ منەت ـ هێرش ـ لەچاو ـ لەناو ـ گرۆبردنەوە ـ خەوبردنەوە .

ل ـ لەگەل چاوگی ( برین ، برینەوە )دا :

دەست ـ قسە ـ رەز ـ مارە ـ نرخ . هووشە ـ ئاسن . تەل ـ سەر .

م ـ لەگەل چاوگی ( گۆڕین ، گۆڕینەوە ) دا :

خۆگۆڕین ـ بار ـ دل ـ دەست ـ جێ ـ شوێن ـ ناو ـ دەنگ ـ

رەنگ ـ سەر ـ قسە ـ بیر . باوەڕ ـ وێنە ـ رێ ـ جێگۆڕینەوە .

شتگۆڕینەوە ..

ن ـ لەگەل چاوگی هەمەرەنگدا :

رقهەڵستان . خۆشویستن . بانگهێشتن . چاوپۆشین .

هەواڵپرسین ـ چلمسڕین . خۆگوشین . جێڕاخستن . دەستڕۆیشتن .

خوشتەن . شەیتان . پێکەنین . ئاواداشتن . ماڵ گوازتنەوە .

دووەم ـ چاوگ × ووشە ، وەک :

بوونەپیاو ، بوونە ـ وەستا ـ شاگرد ـ خزم ـ ناسیاو ـ ئاشنا ـ

چوونە ـ کن ـ لا ـ سەر ـ بن ـ ژێر ـ بەلا ـ دەر ـ پێش گرتنە ـ

خۆ ـ باوەش ـ دانەبەر ـ گردنە سەر ، گردنەبەر ـ دەر کەوتنە ـ دەر ـ

خۆ ـئیش ـ کار ـ قسە ـ گەر ـ لا .

گەیشتنە : جێ ـ لا ـ کن ـ سەر ـ ماڵ ـ شار ...

خستنە ـ : دەر کن ـ .. هاتنەدەر هاتنە ـ لا ـ کن ـ خۆ ـ

هاویشتنەسەر ، ناردنەلای ، نیشتنەسەر ـ بردنەلای ..

## جیا کردنەوەی ووشەی لێکدراو لەتەواوکەری ـ فرمان

بۆ جیا کردنەوەی چاوگی لێکدراو لەچاوگی سادەو دارژاو ٠

١ ـ ووشەی لێکدراو ناتوانێ ببێتە تەواوکەری فرمانەکە ، وەك : لە ( تەماشام کرد ، سەرنجمدا ٠٠ ) ووشە ( تەماشا ) و ( سەرنج ) بەرکار مفعولی فرمانی (کرد) و (دا) نیە ٠ واتە مەحنای فرمانەکە لەیەکەوە ناکەوێتە سەریان ٠

٢ ـ ووشە لێکدراو ، لەگەل (ەکە) ی ناسین ناگونجێ بەلام تەواوکەر ئەشێ ، وەك :( ئاورەکە بدەنەوە ) عەلەیە ، بەلام ( پێنوسەکەم بدەنەوە ) دروستە ٠٠٠

٣ ـ لەکۆبونەوەی هەردکیاندا تەواو کەر پێش ووشە لێکدراوەکە دەکەویت٠ ئەگینا (یان) دەبێتە ناولناوی ، وەك :

کورەکەت خۆش ئەوێ کچەکەت مارەبکە ٠ منالەکەی ژیرکردەوە ٠ نیشەکەی ئەنجامدا ٠ ڕۆژ بەسەر ئەبەم ، دەفتەرەکە پرئەکەمەوە ٠٠٠ ووشەی کابرایەك بووم ٠ سەرنجی نووسینەکەمدا ٠ گرۆی دووێنێم بردەوە ٠ وازی لەمە هێناوە ٠٠ جاوەکو پێویستە زاراوەیێك بۆئەو ووشە لێکدراوە دابنرێ بۆ ئەوەی لەفی گردنەوەی ڕستەدا لەیاد نەکرێ ئەنانەت کەلەفرمانەکەوە دوربێ :

زاراوەی « ڕافرمان » یا « نیوەفرمان » بەلامەوە خەراپ نیە ، ئەوسا دەکرێ :

پەسندی کرد : فرمانی لێکدراوە ـ پەسند : « ڕافرمانە » « نیوەفرمانە » کرد : فرمانی ڕابردووە ٠

فرمانی : « ڕافرمانە » ( نیوەفرمانە ) . ڕێ : پیتی پەیوەندیە ٠ بدە : فرمانی داخوازییە فرمانی ڕێبدە : فرمانی لێکدراوە ٠ ٥ : بکەرە ، ڕاینهاە ٠٠

## چاوگی تێپەرو تێنەپەر

چاوگەکان ـ سادە ، دارژاو ، لێکدراو ـ هێندێکیان بەبکەر (مسند الیە)

تەواو ئەبن‌و پێویستیان بەتەواوکەر ( مفعول ) نیە ، بەوانە دەڵێن ، چاوگی یان فرمانی تێنەپەڕ . هێندێکیشیان واتایان لەبکەرەوە دەگاتە سەر تەواوکەر ، بەوانەش دەڵێن : تێپەڕ . سەیری ئەم خشتە بکە :

| تێنەپەڕ | تێپەڕ | تێنەپەڕ | تێپەڕ | تێنەپەڕ | تێپەڕ | تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بوون | کردن | چوون | ناردن | هاتن | هێنان | کەوتن | خستن |
| بەربوون | بەردان | پچڕان | پچڕین | گۆڕان | گۆڕان | بزووتن | بزاوتن |

ئەمجا هەموو چاوگە فرمانی تێنەپەڕ بەهۆی نیشانە پاشگری (اندن) ەوە دەبێتە تێپەڕ ، وەك : بەزاندن . برژاندن . ڕاپەڕاندن . تەزاندن تڕواندنەوە . جوولاندن . چوواندن . چەوساندنەوە . ڕوواندن . سەپاندن . سوڕاندن . سووڕاندنەوە . سازاندن . ڕانواندن . سەلماندن ..

هەروەها ئەوبێتە دەنگە سروشتیەکانیش ئەخاتە شیوەی چاوگە ـ فرمانی تیپەڕەوە ، وەك : جریواندن . زەڕاندن . گرماندن . قیژاندن .. بەکەمیش هێندێ ووشەی ناوی وەك : بۆڵاندن . نرخاندن . ڕەنگاندن .. برگاندن . سەنگاندن . نەخشاندن . نۆشاندن ..

## قەدو ڕەگی چاوگ :

ڕەگ‌و قەدی چاوگ بەپەیرەوی ئەمخاڵانە ئەدۆزرێتەوە :

١ ـ بەشی زۆری چاوگەکان قەدیان بەفڕێدانی پیتی کۆتایی (ن) دەست ئەکەوێ ، ڕەگیشیان بەلابردنی دووپیتی کۆتایی ئەبێ ، وەك :

| | |
|---|---|
| چاوگ | چوون . گەڕان . هێنان . بڕین ، بینین . کەوتن . مردن . |
| قەد | چوو . گەڕا . هێنا . بڕی . بینی . کەوت . مرد . |
| ڕەگ | چ . گەڕ . هێن . بڕ . بین . کەو . مر . |

٢ ـ هێندێ چاوگی تائی و دالی ڕەگیان بەلابردنی سێ پیتی کوتابیە ، وەکو :

چاوگ : خواردن · کردن · خستن · بیستن · ڕۆیشتن ·

قەد : خوارد · کرد · خست · بیست · ڕۆیشت ·

ڕەگ : خو · ک · خ · بیس · ڕۆ ·

٣ ـ ئەو چاوگانەی بە ( اندن ) تێپەڕاون دەگێڕرێنەوە سەر دۆخی پێشوویان ، ئەوسا بەپێرەوی خالی یەکەمیان بۆ دەکرێ ، وەکو :

| | |
|---|---|
| چاوگ | تاساندن · دۆڕاندن · هەڵسووڕاندن · خولاندنەوە · لەقاندن · |
| دۆخی‌خۆی | تاسان · دۆڕان . هەڵسوڕان · خولانەوە · لەقین · |
| قەد | تاسا · دۆڕا · هەڵسووڕا · خولاوە ، لەقی · |
| ڕەگ | تاس · دۆڕ · هەڵسووڕ . خول · لەق · |

## سوودی قەدو ڕەگی چاوگ :

زانینی قەدو ڕەگی چاوگ دوو سوودی هەیە :

١ ـ قەد + پاشگر ، ناوی داڕژاو یان داتاشراو سازئەکا ، وەکو ڕابراوە ·

٢ ـ ئاولکەرو ئاولکاراو و فرمان هەرسێکیان لەقەدو ڕەگی چاوگە دروست ئەبن وەکو بەمزووانە دێن :

چەشنی دووەمو سێیەمو چوارەمی وشەی فرمان [ ئاولکەر | ( الصفة المشبهة )و ئاولکارا ( اسم الفاعل ) و ئاولکراو ( اسم المفعول ) · ]

ئاولکەر لەقەدو ڕەگی تێپەرو تێنەپەر ساز ئەبێ بەیاریدەی نیشانەی ( او ، و ، یو ) ، بەلام ئاولکاراو ئاولکراو هەردووکیان لەقەدو ڕەگی تەنها تیپەڕ سازدەبن بەیاریدەی نیشانەی ( ەر ، ێنەر ) و ( ڕاو ، ێنراو ) · هێندێ جاریش (نە)و پێشگری داڕێژ ( هەڵ ـ دا ، ڕا ·· ) هەوێنی نیشانەکان ئەگرنەوە ·

بۆ پێشاندانی نموونەی ئەمانەش پێویستی بەم خشتانەیە :

١ ـ خشتەی ئاولکەر لەقەدی چاوگی تێنەپەڕ ، سادەو داڕژاوو لێکدراو ·

٢ ــ خشتەی ئاولکاراو ئاولکراو لەتێپەڕ : سادەو داڕژاو ٠
٣ ــ خشتەی هەردوکیان لەچاوگی تێپەڕ دۆخی لێکدراوی ٠
٤ ــ خشتەی هەردوکیان لەچاوگی تێپەڕکردوو بە (اندن) سادەو دارژاو ٠
٥ ــ خشتەی هەردوکیان باری لێکدراوی ٠٠٠

## خشتەی ئاولکەر ( الصفة المطاوعة )

| سادەو داڕێژراو | لێـــکدراو |
| --- | --- |
| گۆڕاو ٠ گوراو ٠ هەڵگەراو ٠ شێواو ٠ دۆراو ماو ٠ نەماو ٠ | دەستو پێ سووتاو |
| ناسیاو ٠ تاساو ٠ خووساو ٠ تۆواوە ٠ رازاوە پاڕاوە ٠ | رەنگ گۆڕاو جل دراو |
| وەستا ڕاوەستاو ٠ هەڵنەپچڕاو ٠ ڕاکشاو داڕژاو ٠ | چاو نەترساو چاو نەترس |
| تۆراو ٠ حەساوە ٠ دڕاو ٠ شکاو ٠ سووتاو داما ٠ گریاو ٠ | ڕق هەستاو |
| دامەزراو ٠ ژاکاو ٠ قرتاو ٠ پەشۆکاو هەڵتروشکاو ٠٠ | دەست خاراو ٠٠ |
| کەوتوو ٠ هەڵکەوتوو ٠ گەیشتو ٠ تێگەیشتوو خەوتوو ٠ | دەست کەوتوو ٠ جۆش |
| نووستوو ٠ نیشتوو ٠ دانیشتوو ٠ ڕویشتوو هاتوو ٠ | خواردوو ، سەر هاتوو |
| داهاتوو ٠ هەڵهاتوو ٠ پشکوتو ٠ بزوتوو مردوو ٠ رابردوو ٠ | پێش کەوتوو ٠ دڵ مردوو |
| پەڕیو ٠ هەڵپەڕیو ٠ تەقیو ٠ هەڵتوقیو چەقیو ٠ داچەقیو ٠ | دەرکەوتوو ٠ سەر |

| ساده و داڕێژراو | لێکدراو |
| --- | --- |
| کولیو · رزیو . فریو · هەڵقەریو · گەییو مەییو · تەپیوا ، دا .. | کەوتوو ، کەس نەویستوو |
| تۆپیو · دەربەڕیو · خەسیو · داپەزیو هەڵماسیو .. | رەنگ پەڕیو .. |
| بۆ باری نەبوونیش نیشانەی (نە) یان لەگەڵ دەخرێ : | چاو هەڵتوقیو .. |
| نەگۆڕاو · نەدۆڕاو · هەڵ نەدراو · نەزاگاو · | دەست لێبڕزیو |
| نەکەوتوو · تینەگەیشتوو · تەمر ، نەمردوو نەبەز .. | خۆش ویستوو<br>خۆشەویست · |
| نەکولیو . نەکول · نەتەقیو · نەتەزیو · نەگور | کەس نەکێڵ · |

## لەقەدی چاوگی تێپەری ڕاستەوخۆ ( ناولکارا )

### ناولبکەر ــ اسم الفاعل ــ
### سادەو داڕژاو

بەستەر · کێشەر · بینەر · هێنەر · گۆڕەر ·
بیەر · دانەر · نووسەر · پشکنەر · زانەر · پارێزەر ·
دیتەر · پۆشەر · دۆشەر · ناسەر · بێژەر · هاوێژەر ·
هەلدەر · نێرەر · چینەر · هەلهێنەر · داهێنەر · لێنەر ·
ڕاکەر · تێکەر · ڕاکێشەر · بادەر · لێکدەر · هەلگر ·
هەلمژ ، زانا · توانا ·

### ناولکارای لێکدراو

نانکەر · ئیشکەر · قسەکەر · بەخێوکەر .
خواپەرست · مالپەرست · کۆلدەر · بەلێندەر · خزکر ·
دەستگر · جێگر · وێنەگر · مانگر · پێشخەر · دەرخەر ·
قسەزان · یاریزان · دەستگێر · بانگێر · چاپەز . ئاشپەز ·
هاندەر · ئەنجامدەر تەختەسڕ · دەستەسڕ · چابەست ·
دەمبەست · کاکێش جگەرەکێش · بەرگدوو · پینەدۆز ·
بیرخەرەوە · شووشەبڕ · ئاسنبڕ · دەستشۆر · جلشۆر ·
نامەبەر · بارەبەر · کاتژمێر · بێستانڕن · تووتنفرۆش ·
میوەفرۆش · دانساز · تەنەکەساز ·
سووخۆر · سوێندخۆر · دارتاش · سەرتاش قسەنەزان ·
کۆلنەدەر · چاونەشۆر ··

### ناولکراو ــ اسم المفعول ــ
### سادەو داڕژاو

بەستراو · کێشراو · هێنراو · گوڕەڕاو ·
بیستراو · دانراو · نووسراو · پشکنراو · پۆشراو ·
داپۆشراو · ناسراو · بێژراو · هاڕاوە · هەلدڕاو ·
نێرەڕاو · چینراو · هەلکەنراو ، سپێراو · داهێنراو ·
هەلهێنراو · بەستراو · هەلبەستراو · چنراو · چێنراو ·
هەلگیراو · ڕاخراو · دوەراوە · زانراو · داچێنراو ·
هەلپچراو · بەخشراو · تاشراو . فرۆشراو ·

### ناولکراوی لێکدراو

دروستکراو · بەخێوکراو · مارەکراو · دەرکراو ·
ووردکراو · چاپکراو · مۆرکراو · بلاوبەکراوە ·
سەرگیراو · ڕێزگیراو · بادراو · فوودراو · بەردراو ·
گرێدراو · جۆشدراو · بەکرێدراو · کلیلدراو ·
بەشوودراو · دەرخراو · سەرخراو · دوورخراو ·
ڕاونراو · دەستبڕاو · دەرنەبڕاو · سەرتاشراو ·
سەرپێچراو · ئەنجامدراو · ئاودراو · دەمبەستراو ·
خاترگراو ، بەرگراو · ناوبراو . چاولێکراو · پەکخراو ·
بەکارهێنراو · بانگهێژراو · چاوفلیقاو · تامچێژراو ·
بەشخۆراو · مالکراو . دەنگزراو · بەرهەلدراو ·
ڕەنگ ڕێژراو دەرهێنراو · ناونوسراو · سەرهەلپاچراو ·

## لەمەدو ڕەگی چاوگی تیپەڕ کردوو بە ( اندن )

| ناوکارا<br>ناولبکەر<br>سادەو داڕژاو | ناوکراو<br>سادەو داڕژاو |
|---|---|
| چەقێنەر • ڕووێنەر • تەکێنەر • قرتێنەر . گەیێنەر • ڕاگەیێنەر • پسێنەر • ترسێنەر . شکێنەر • سووڕێنەر • هەڵسووڕێنەر • لکێنەر • نووسێنەر • ڕشێنەر • هەڵوەشێنەر • خولێنەرەوە • کولێنەر . بزوێنەر • بەزێنەر • خووسێنەر • نووێنەر • هەڵتەکێنەر • تووێنەرەوە • چەرسێنەر فڕێنەر • تەزێنەر • مەیێنەر • | جوولێنراو • دەرپەڕێنراو • برژێنراو • چووێنراو • خەملێنراو • چەقێنراو • فڕێراو • سەپێنراو . سەلمێنراو • نوشتێنراو • سازێنراو • شکێنراو • داشکێنراو • نەخشێنراو • ڕشێنراو • دووێنراو • پسێنراو • بزوێنراو • هەڵوەشێنرا • تووێنراوە • ڕازێنراو • شیێنراو • دەشسێنراو • گەیێنراو • ترسێنراو • هەڵسەنگێزاو . ڕاهێنراو • |
| **ناوکارای لێکدراو** | **ناوکراوی لێکدراو** |
| گێرەشێوێن • سەخۆشی پەڕێن • کەللەتەزێن • دڵبزوێن • چاوترسێن • کەمخایێن • سەرسوڕمێن • فەڕشتەکێن • پیتەبزوێن • گەشتەسێن • شەکرشکێن • تووتنچەقێن • ناورشێن • | سەرپسێنراو • چاترسێنراو • کەللەتاسێنراو • دڵشکێنراو• سەرناوسێنراو• لەبیرچوێنراو• دوواکەوێنراو. دەستتەزێنراو • |

## بەشی پێنجەم - فرمان

فرمانەکان لەفەدو پەکی چاوگەکانی پێشوو سازدەبن بە یاریدەی یەکێك لەم نیشانانە ( دە ٠ ئە ٠ ب تە ٠ نا ٠ مە ٠ وا ٠ رێ ) لە (١٦) ریزە ( صیغة ) دا هەکتیان بۆ ناوبردنی بکەرو هەشتەکەی تر بۆ دۆخی ناونەبردنی لەهەردوو باری بوونو رووندادنا ، وەکو بەرەوە :

| باری بکەر ناوبراو ( المبنی للفاعل ) | باری بکەر ناونەبراوی ( المبنی للمفعول ) |
|---|---|
| **١ - فرمانی رابردووی سادە ( وەبەق ) :** | |
| = قەدی چاوگ ، وەك :<br>تاکسیەکەم : فرۆشت - نەفروشت - بردا - برنەدا ٠<br>فرۆشتم ، نەمفرۆشت ، برمدا ٠ برمنەدا ٠ | = قەد + را ، وەك :<br>تاکسیەکە :<br>فرۆشرا - نەفرۆشرا - بردرا - برنەدرا ٠ |
| **٢ - فرمانی رابردووی هەمیشەیی :** | |
| =دە + قەد ، وەك :<br>تاکسیەکەم : دەفرۆشت - نەدەفروشت - بردەدا - بر نەدەدا ٠<br>دەمفرۆشت ٠ نەمدەفرۆشت ٠ برمدەدا . برمنەدەدا ٠ | =دە + قەد + را ٠ وەك :<br>تاکسیەکە :<br>دەفرۆشرا - نەدەفروشرا - بردەدرا - برنەدەدرا ٠ |
| **٣ - فرمانی رابردووی نیزیك :** | |
| = قەد + وو ، وەك :<br>تاکسیەکەم : فرۆشتووە - برداوە - برنەداوە ٠ فرۆشتومە ٠<br>نەمفروشتووە ٠ برم داوە ٠ برمنەداوە ٠ | = قەد + راو ٠ وەك :<br>تاکسیەکە :<br>فرۆشراوە ٠ نەفرۆشراوە ٠ برداوە ٠ برنەدراوە ٠ |

٤ ـ فرمانی ڕابردووی دوور :

| باری بکەر دیاری ( المبنی للفاعل ) | باری بکەر نادیاری ( المبنی للمفعول ) |
| --- | --- |
| = قەد + بوو ، وەك :<br>تاکسیەکەم ـ فرۆشتبو ـ نەمفروشتبوو · بـڕادبوو · بڕنەدابـوو · فرۆشتبوم · نەمفـروشتبو · بـڕمدابێ · بڕمنەدابوو · | = قەد + را + بوو · وەك :<br>تاکسیەکە :<br>فرۆشرابوو ـ نەفرۆشرابوو · بڕدرابوو ـ بڕنەدرابوو . |

٥ ـ فرمانی گومان : ووشەی ( ڕەنگە · دەبێ . لەوانەیە ) ی لەگەڵ بەکاردێ ·

| باری بکەر دیاری ( المبنی للفاعل ) | باری بکەر نادیاری ( المبنی للمفعول ) |
| --- | --- |
| = قەد + ب ، نە + قەد + بە · وەك :<br>تاکسیەیەکەم :<br>فرۆشـــتبێ · نەمفرۆشــــتبێ ـ بـڕدابێ ـ بڕنــەدابێ<br>فرۆشتبێتم نەمفرۆشتبێ · بڕمدابێ · بڕمنەدابێ · | = قەد + را + ب/نە + قەد + را + ب · وەك :<br>تاکسییەکە دەبێ :<br>فرۆشرابێ ـ نەفرۆشرابێ ـ بڕدرابێ ـ بڕنەدرابێ · |

٦ ـ فرمانی خۆزی : ووشەی ( بریا · خوزگە )ی لەگەڵ دەبـرێ :

| | |
| --- | --- |
| ا = ب + قەد + با . وەك :<br>بریا تاکسیەکەم :<br>فرۆشتبا ـ نەمفرۆشتبا ـ بڕدابا ـ بڕنەدابا ·<br>فرۆشتبام · نەمفروشتبا · بڕمدابا · بڕمنەدابا · | = قەد + را + با / نە + قەد ··· وەك :<br>تاکسییەکە خۆزگە :<br>فرۆشرابا · نەفرۆشرابا بڕدرابا · بڕنەدرابا · |

### ٧ ـ فرمانی داهاتوو ـ ڕانەبردوو ـ ئامادەو ئاینده :

| | |
|---|---|
| =ده ، نا + ڕەگی چاوگ + ڕاناو ، وەك :<br>تاكسیەكەم :<br>دەفرۆشم ـ نافرۆشم ـ بڕنەدەم ـ بڕنادەم . دەیفرۆشم<br>نایفرۆشـــم . بڕی‌نەدەم . بڕی‌نادەم . | =ده ، نا + ڕەگ + ڕێ + ڕاناو ، وەك :<br>تاكسیەكە :<br>دەفرۆشرێ ـ نافرۆشرێ ـ بڕدەدرێ ـ بڕنادرێ . |

### ٨ ـ فرمانی داخـوازی ( فەرماندان ) :

| | |
|---|---|
| =ب ، نه + ڕەگ + ڕاناو ، وەك :<br>باتاكسیيەكەم :<br>بفرۆشـــم ـ نەفرۆشـــم ـ بڕبـــدەم ـ بڕنـــەدەم .<br>با ـ بیفرۆشم ، نەیفروشم ، بڕی‌بدەم ، بڕی‌نەدەم .<br>پێتی (با) بۆ هاندان لەگەڵیدا بۆ كەسی یەكەم بەكار دێت . | =ب ، نه + ڕەگ + ڕێ + ڕاناو ، وەك :<br>با ـ تاكسیەكە :<br>بفرۆشرێ ـ نەفرۆشرێ ـ بڕبدرێ بڕنەدرێ . |

## دەرگای چوارەم ـ ووشەی ڕاناوی :

ڕاناوەکان بەتێکرایی دەکرێنە سێ بەربەشەوە :

یەکەم ـ ڕاناوی کەسی :

ڕاناوی کەسی دوو جۆرە : سەر بەخۆو لکاو وەکو لەو خشتەی ژێرەوەدا نیشان دراون :

| کەسەکان | ڕاناوی سەر بەخۆ ( جیا ) | | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|---|---|
| | تـاك | کـۆ | تـاك | کـۆ |
| کەسی یەکەم | ئـەز<br>مـن | ئـەم<br>مـە<br>ئێمـە | م | ن<br>ین<br>مان |
| کەسی دووەم | تـە<br>تـو<br>تـۆ | هنگۆ ( ئنگۆ )<br>هـون<br>وە ، ئێوە | ت<br>یت | ن<br>تـان |
| کەسی سێیەم | وی ، ئەو ، ئەوی<br>وێ ، ئەو ، ئەوێ | وا<br>وان<br>ئەوان | ە ، ا<br>ی<br>ێ | ن<br>یـان |

لەم خشتە دەر ئەکەوێ کە ڕاناوی کرمانجی ژوورو و خوارو و جیاوازییێکی ئەوتۆیان نیە باس بکرێ جگە لە ( ئەز ) کە لە دراوسێ ئەورووپییێك هاتبێتە ناوەوە ، هەروەها ( هون ، هووین ، هنگۆ ، ئنگۆ ) کە نازانم لەچیەوە هاتووەو ناوچەی خۆشناوەتی و دەوروبەری وەکو بادینان لەبری ( ئێوە ) بەکاری دەهێنن ٠

پیتی « ە » ش وەکو ڕاناوێك لەسێ شووێن دا ئەرك ئەبینێ ٠

١ ـ لەفرمانی ڕابردووی نیزیك دا بـۆ کەسی سێیەمی تـاك ، وەکـو ڕۆیشتوە ، ئەم دیتووە ، هەستاو · نەیهێناوە . هاتۆتەوە ··

٢ ـ لە فرمانی داخوازی دا بۆکەسی دووەمی تاك ، وەك :

وەرە · هەستە · دانیشە · بەفرمانیش : برۆ · ڕاکشێ ، داوەشێی ·

٣ ـ لەگوزارەی رستە نافرمانی دا بۆ کەسێ سێیەمی تاك ، وەك : کـات درەنگە · حەرفت ڕەقە · قسەت خۆشە · هینەکە چلە ··

## ئەرکی ڕاناو لەڕستەدا

ڕاناوی سەر بەخۆ تاکو کۆ لەڕستەدا دەوری « ناو » دەبینن هەرچی ڕاناوی لکاویشە ئەم ئەرکانەی هەیە :

ا ـ بکەر ( نیهاد یا : راینهاد ) :

کاتێك بکەری سەر بەخۆ لەئارادا نەبوو ڕاناوەکەی بکەرەو جیگریەتی وەك : هاتم چیت کردووە · بکرە · برۆن · خەڵاتێکیان پی بەخشی · کوڕێکتانم گرتووە · سەرنجم لێ داون ، مەڕەکانی دوورخستنەوە ·

ب ـ جێگری نیهاد لەڕستەی نافرمانیدا ، وەك : باشە · شارەزان · گەووەیت ·

ج ـ تەواوکەری ڕاستەو خۆو بەیاریدەش ، وەك ·

نایگرم · دەیگرم · دەیان برد · دەیان هێنم · هەڵم گرە · هەڵمان سێنە ڕات ناگرم · داتان نابەستم ··· بیهێنە · بیان کوڵێنە · پێم بڵێ · تێمان بگەیێنە · لێت گەڕاوم · بۆتاندەنێرم · بۆی بکرە · لێیان مەدە بەڵام لەشی کردنەوەدا فەرامۆش دەکرێ ·

د ـ ئاوڵناو ، وەك :

دەری بچۆینە · ڕێکیان بخە · ئازاریان مەدە · ناوت چیە ،ماڵتان ئاوابێ · ڕقم لێ هەستاوە · ڕۆژمان ئاوا کرد ··

بەڵام لەمانەدا تەنها خالی یەکەم ( بکەر ) لەشیتەڵ کردنەوەدا ناوی ئەبرێ بە ( بکەر و نیهاد یا رانیهادە ) · لەوانی تر دا شیتەڵی باش

گرۆی دەخرێ ٠ دووەم ـ ڕاناوی خێویەتی بەیەکێك لەم دوو دۆخانە :

١ ـ ڕاناوی ( هی ) و ( ئی ) ی تایبەت بەو مەبەستە ، وەك :

ئەم زەوییە هی تۆیە ٠ ئەوکۆشکە هی منە ٠ ئەو خانووە هی کێیە ؟ ئەم پێنوسە هی ئیوەیە ٠ باخچەکە هی ئیمەیە ٠ سەگەکە هی ئەوە یا ئەوانە ٠

٢ ـ پێی ( ەکە ) + ڕاناوی لکاو ، وەك :

زەویەکەم فرۆشت ، خانووەکەت کڕی ، بەلێنەکەت بەسەر مەبە ، سەعاتەکەم بزر کرد ٠٠

٣ ـ ووشەی ( خۆ ) لەگەل ڕاناوی لکاودا ، وەك :

تاکسیەکەی خۆم ، خانووی خۆت ٠ بەقسەی خۆی ٠ بەدلی خۆمان هاورێ ی خۆتان ٠ منالی خۆی خۆش ئەوێ ٠ خزمەتکاری خۆیانە

سێیەم ـ ڕاناوی نیشان دان :

ڕاناوی نیشان دان برێتین لە ( ئەمە ، ئەم ـ ە ، ئەم ـ انە ، ئەوە ، ئەو ـ ە ، ئەو ـ انە ) بەدوو ڕێچکە :

١ ـ نیشان دانی دیار :

کە شتەکە بەرچاوی بوو بە ( ئەمە ئەمانە ، ئەوە ، ئەوانە ) نیشان ئەدرێ یاخود ناوەکەی دەکرێتە پاشکۆی ئەو ڕاناوانەو دەگوترێ :

با ئەمبێت ٠ ئەمیان باشترە ٠ ئەمە چیە ؟ ئەمانە هەل بگرە ئەم کورەم دیتووە ٠ ئەم قاتانەم لێبکڕە ٠ ئەوە هەرزانە ٠ ئەوانەباشن ئەویان کرێتە ٠ ئەوەی من گرانترە ٠ ئەو قوماشە ئەستوور ترە ٠ ئەو خزمانە چۆنن ، لەم نموونانەدا پاشکۆیەکە ناولناوە ، وەکو باس کراوە ٠

٢ ـ نیشاندانی بزر :

کاتێ شتەکەیان کەسەکە بزر بوو بە ڕستەیێکی وەسفی لایەنێکی ڕوون دەکرێتەوە و هەمووی دەکرێتە پاشکۆ ، وەك : ئەو باوکە چاکەی تۆ هەتە ٠ ئەوەی زۆر بخوا ٠ ئەوانەی وەکو منن ، ئەوکەسەی خانووی سەر بەخۆی

هەبێ . ئەو قسانەی پێم گوتێت .. لەمجۆرە نموونانەدا ڕاناوو پاشکۆیەکەی پارستەیێکی وەسفی پێك ئەهێنێت : ( ئەوەی زۆر بخوا ) و لەگەڵ شارستەکەی‌دا ( زۆر نازێ ) ڕستەیێکی ئاوێتەیە بە ناوی ( ڕستە ئاوێتەی وەسفی ) دروست ئەکەن ، وەکو لەباسی ( ڕستەی لێکدراو ) دا دێ .

## دەرگای پێنجەم ... ووشەی ئامرازی

ئامرازەکان دوو بەر بەشن : ڕابەستو مەبەست ..

ئامرازی ڕابەست سێ جۆرن :

یەکەم ئامرازی پەیوەندی

واتە هۆی پەیوەندو بەستنی ووشەن بەگوزارەوە ، وەك : ( ە ، بە ، بە ـ وە ، بە ـ دا ، لە ، لە ـ وە ، لە ـ دا ، بۆ ، تا ، وەك ، جگە ، چش .. ) لەگەڵ هەندێ ئامراز کە لێکدەرو بەستەرەکان دا دێن ، بۆنموونە :

١ ـ ە : گەیشتە جێ ، هاتە لام . چۆتە کووێ ! چاوی بڕیە مێشەکە ، گوێنم نەدایە پرتەو بۆڵەی ، هەموو دەچینە بەر ئاستانەی خوا ..

٢ ـ بە : بەگاز . بەدەست . بەهەڵە . بەزەنگەکەوە . بەگەردنت . باوەڕ بەمن . بەسەری تۆ . دەستی بە حەواوە . بەسەریدا بەو ساکاریەش . بەخۆڕایی . بەدۆزەخ . بەماسوولکە . بەخێری .. بەلۆری . بەخوا . بەزەحمەت . بەوحاڵەش . بەڕاستی . بەگوێرەی خۆی .

٣ ـ بە ـ وە : بەپۆزێکەوە . بەتەوسەوە . بەنێکەنینەوە . بەدانیشتنەوە . بەئاسمانەوە . بەلای خۆتەوە . بەئەورووپاوە . بەدیارتەوە . بەدەستەوە . بەپۆستاڵێکەوە . بەخوێوە . بەسەر پێوە .

٤ ـ بەددا ، بە ـ را : بەسەرەوەدا . بەکنتدا . بەکۆڵانێکدا . بەبازاریدا . بەچڕا دەزانی ..

٥ ـ لە : لەئێمەی مەشارەوە . لەشوێنی . لەخوا . لەتۆ زیاتر . سەرم لەقسەکانی . لەدەوری باڵات . لەسەرمایێ . لەبن باخەڵ .

لەوورچیش · لەبەرهەیوانی · لەکووێ ·· لەسەر زەوی · لەبن ،
لەکن ، لەلا · لەژێر · لەپێش · لەپاش · لەدووا · لەکۆتایی ·
لەبر · لەپشت · لەنێرە · لەئەوێ · لەئەم · لەئەم ، لەئەو ·· لەمچەشنە ·

٦ ـ لە ـ وە :

لەکەیەوە · لەژوور پیاوەکەوە · لەبن لێوانەوە · لەدەمی منەوە ·
لەوڕۆژەوە · لەکوێوە · لەلایێکی‌ترەوە · لێرەوە · لەوێوە · لەسەرەوە ·
لەناوەوە · لەدەرەوە · لەپاشەوە · لەتەنشتیەوە ·

٧ ـ لە ـ دا ، لە ـ ڕا ، لەگەل :

لەمیژوودا · تفی‌لەدەمدا · لەدەرفەتێکدا · لەگووێی گادا · لەووزەمدا·
لەچاومدا · لەکاتی هاتنەوەی دا ·· لەسەرەوەڕا · لەبەیانی‌ڕا · لەتۆڕا ··
لەگەل کێتە ؟· لەگەل چیمەنتۆ · لەگەل براکەی‌دا · لەگەل ئەوەش‌دا ·
لەگەل‌تە ·

٨ ـ بـۆ :

هێندێ جار ناو یا ڕاناوەکەی دوواوەی لا ئەبرێ : سەعاتێکم بۆ بکرە ··
نموونەشی‌وەك : بۆ خووا · بۆکووێ · گوێم بۆ قسەکانی · بۆشەوی جومعە ·
بۆیەکتری دەگێرنەوە · بۆهەمو کاتێك · بۆچیروك نقیسی · بۆنافەکی مەزن ·

٩ ـ ژ ، ل :

ل شوونا · ل تەنیشتێ · لدەوسا · ل ئورتا · لنێزیکی · ژفیر پێش
( لەمەو پێش ) ژچینێ هاتن · ژمالێ بەرێ کەفن · ژخەوێ رابوو · ژمێ
کەنار ئاگر بەردا خانی سۆران ژسەرقید رواندزێ بهیستیە · لدوماهیا ·
لسەر سارتەو · لژێر دروێ ·· ژیارێز گەها سلێمانی · لدەف تێبا کڕیی ·
لڕۆژ تێك شەمبێ ·· لمبیراتەیە ·· ژناف ، لپاش · ژنك · لهنواف ·
لدووی · لدوور · لنك · لهەمو جیهان ··

١٠ ـ ب ، ە :

بدەنگێ مەلێ بافەر ناکـە ، بسەری‌خوە ، لبسەرێ ئە · بدەسنی ،
خەلکی · بگولەکێ بهارنایێ کوردا تورکیا بلاتینی دنفیسن · بهاتنا وە دلێ من

شابوو ٠ بمەزنو بچویکفە ، برمیا ـ ترێ دبە ب مویژ ٠ ئاف دبێ ب بووز ( سەهۆل ) ، دەست بسترانا کری‌یە ٠ د جیهانی دا ٠ دڤێ رۆژێ‌را ٠ دهوزانێن خوەدا ٠ دپاقژ کرنا زمانێ کوردی‌دا بخوهشی‌و بقەنجی بژین ٠ بتنێ ، بکار هینایە ٠ بگەلەك رەنگا بدەنگ‌و ئاواز ٠

١١ ـ تو ، ( بۆ خاتر خواهی‌و سوێند دانە ) :

تو سەری خۆت ٠ توخوا ٠ توپێغەمبەر ٠ توگیانی خۆت ٠ تو بی‌خوا ٠٠

١٢ ـ تا هەتا ـ :

تا کرۆیێ ئەرۆێت ٠ تائێژە وەرە ٠ تانیوە شەو ٠ تا گەرەکی خوارو ، تاکەی دڤێ گەرێ خرهدا تا بهەڤلێرێ چووە ٠ هەتا هەتایێ ٠ حەتا دوتینێ ٠

١٣ ـ وەك :

وەك پیاو ٠ وەك دۆ سپی‌یە ٠ وەك من بەخۆوەیە ٠ سویسرا وەك : وەلاتی‌مەیە ٠ وەك نەبای دیبێ نەباران ٠٠

١٤ ـ جگە ، بیجگە ، جش :

جگە لەچەند نموونەیێکی نارێك ٠ بیجگە لەسەر ئیشان ٠ بێجگە لەناخۆشی جش لەو سەرئێشەیە ٠ جش لەو هەراهەرایە ٠ جش لەدەعباش ٠

١٥ ـ پێ ، تێ ، لێ :

ئەم‌سێ پیتانە ڕاناوی لکاوبان بەدوواداد دێت ، وەك :

پێم ، پێمان ، تێت ، تێتان ٠ لێی ٠ لێیان ٠٠ هەندێ جار ڕاناوەکەیان لێ فرێ ئەدرێ‌و بەتاکی ئەمێننەوە ، وەك :

سیپارەیێکی لێ وەرگرت ٠ سێ‌چوارێکی لێ ڕاست بوونەوە ، کەوچکی تێ نەدەگەڕا ٠ بەردێکی تێ‌گرت ٠ پەنجەیێك هیچی پێ ناکرێ ٠

دووەم ـ ئامرازی لێکدەر : ئەمانە لەباسی ڕستەی لێکدراودا ، دێن ٠

سێیەم ئامرازی بەستەر : ئەمانەش لەباسی بەستنی ڕستە بەڕستەوەدا ، دێن

جۆری دووەم ـ ئامرازی مەبەست :

ئامرازی مەبەست بەتێکرایی جووار بەربەشن :

یەکەم ـ نیشانەو ئامرازی بانگ هێشتن ، بروانە ئەم خشتەیە :

| نیشانە | ئـامـراز : |
|---|---|
| ە ، ەکە : کاکە · خالە ، پیاوەکە ، ژنەکە ، ۆ ، ێ : کوڕۆ هەڤالو ، کچە ، کچێ ، ڕەوشێ · خالـو ، مامـۆ ، باڤۆ ، خوشکێ ، پووریێ ·· ینـە ، ین : کورینە ، پیاوینە ، ژنینە · | هۆ ، هەی : هۆی نازێ ، هۆی کاکە · هەی کوڕی باش · هەی نابەسند ·· ئەی ، وەی : ئەی جامێر · ئەی ژن ·· ئەی گەلی وەفادار ، ئـەی گەورەم ، یـا ، وا ، ئـەرێ : |
| یە : خوایە · ناریا · حـەمدییا · بـەبێ ئامـرازو نیشانەش زۆرە : بارام : وەرە · برام لاچۆ · کاك روستەم · ماموەستا ·· | یاهەڤالێ دەلال · یا کەسـا مـن وا گـاورێ · وەی لادایێ ئەرێ برا ، ئەرێ هەڤال گەلێیاران · |

دووەم ـ ئامرازی پرسیار ، وەك :

( ئەرێ ) چیت کرد ؟ ( ئایا ) دەمێکە نووسیتووم ؟ ( ئەدی ) ئەڤ شەو نو بخوە نەنفستی ؟ ( ئاخۆ ) ئیستاش بەرق‌و کینەیە ؟ ( داخوا ) قەڵەمێکی باشم بۆ ئاهێنێ ؟ ( بۆ ) لا نادەیت ؟ ( لۆ ) خەفەت نەخۆیت ؟ ( بۆچی ) ئەوان گۆرانی لەوەلاتی ئێمە بلێن‌و ـ ؟ (چ) بلا بی خوشکە نەسرین ، بۆن بێنە نان‌و هەنگوین (چ) دەکەیت ؟ ئەڤ (چە) کەسە ؟ چیت دەوێ ؟ ( ما ) ئەهریمەن خودێیە ؟ ( چما ) ئالتوون زەنگ هەلدێنێ ؟ لە ( کێ ) دەپرسێت ؟ ئەو کابرایە ( کی )یە ژ ( کا ) بارام ؟ ( کووا ) شەمچەکە ؟ بۆ ( کووێ ) دەچی ؟ ئارام ل ( کوو )یە ؟ ( کوو ) هاتی ؟ ( کوو )یت ؟ ( کێرا ) تەواو بوو ؟ ( کووێرا ) لێ بوویتەوە ؟ ( کێهەت ) دەوێ ؟ فەرهاد ( کێژانە ) ؟ . ( کام ) کوڕەیان بوو ؟ کامیانت پێ باشە ؟ ( کامەتا ) نموونەی جووان ؟ چۆن کۆشکێکە ؟ ( چۆن ) بەقسەت ناکا ؟ چەوا جێم دبێت ؟ هاڤریکەت ( چاوا ) یە ؟ تەمن دروستێت چلۆنە ؟ چتەوری ؟. ( چقا ) بەزێ وە هەنە ؟ ( چەند ) دۆنم زەویتان هەیە ؟ ( چەند ) جارم پی گوتی : بەرم دە ؟.

سێیەم ـ ئامرازی وەلام ، وەك :

لەگەلم دێیت ؟ ( ئا ) دێم ، نائیت بچینە هەولێرێ ؟ (با) ئامادەم باوکت لەماڵەوەیە ؟ ( بەلێ ) لەماڵەوەیە . ( نە ) بارام ( نە ) ل ماڵە ( ئەرێ ) بەخوا ، ( بەرێ ) واللە درۆ ناکەم . ئەزدین هەری بازێر ؟ هەرواش : ( ئێ ، ئۆژ هۆو ، ئەدێ ، ئەی ، بەلێ .. )

( نا ) ئەزدین ناچی بازێر . نەشکاون ؟ ( نەء ) نەشکلون ، .. هەروەها ئەم ووشانەش ( نەهـ ، نەهەن ، نیە ، نینە ، خەیر ، قەت ، هەرگیز ، هاَ جاَ ، بەدی .. )

پرسیارو وەلام بێ ئامرازیش دەبن ، وەك :

هۆرمز هاتەوە ؟ هێشتا نە هاتۆتەوە ، بیرت لێ کردۆتەوە ؟ پێویست .

بەبیر کردنەوە ناکا • براکانیشت ژنیان هێناوە ؟ تەنها یەکێکیان مـاوە ژن بهێنی • چوارەم ـ ئامرازی هەڕەمەیی ، بۆ :

( هاندان و واق وورمان و پەسن و پلارو خۆزیو گـومان و پێخوشی و ناپێخۆشی ••• وەك :

( دە ) فەرموو بیدوێنە • ( بـا ) هەسـتین • ( دەبا ) پیاسەیێکی لێ بکەین • ( سـا ) منیش نایدوێنم • ( دەسـا ) ئـەبێ هـەرخۆت تـەواوی بکەیت • ( جـا ) تۆش مەچۆ بۆ لای ، ( دەجا ) چت پێ بلێم ! ( جـا ) بـا ئەویش بێت ـ ( ئای ) لەو زیکەزیکە ( ئایئای ) لەو هەورە چڕانە • ئەی لەو پیاوە ! ( ئەیئەی ) لەو چیمەنە سـەوزە ! ( تهێـو ) نـەت پێکا • ( ئەیهوو ) بەیتی مێشییە ! ( هەیهوو ) چەند دوورە ! ( ئاها ) چیم بـۆ هێناوی ! ( تش ) وی فەرهاد ژمەرە ئاریکاری بکە ( چش ) با بۆ تۆ بێ ، ( تیاح ) لەو هەموو مەرانە ! ( تەح ) لەو تەسجیلە جوانە ! ( پیاح ) لـەو هەموو زۆر وەڕیە ! ( پف ) لەم نموونانە ! ( ئیف ) زۆر باشە ، ( تف ) لەو مێشك پووچانە ( پەککو ) لەوێ ەەلاماتێ ! ( وەی ) لەو سـەرمایە ! ( وەیوەی ) لەو بارانە ! ( هەیهەی ) لەو ڕۆژگارە خۆشانە ! ( بەهبەه ) لەو شایی ولۆغانە ! ( هەك ) کوڕۆ ! تو لەفـرە چ دکی !؟ ( دەك )ـسـەرت أصلع بێ ( خەی ) لەو هەوایە خۆشـە • ( ئوخوهش ) چـەند سـەرم سووکە ، ( ئۆخەی ) دلم سایەوە ، ( حەیف ) بۆ تەمەنی لاوی ( دریغا ) عومری شیرینم چ زوو هات و چ زوو ڕۆیی ! ( ئۆی ) وەستا بغرێم ! ئەوە تۆی ؟ ( ئاخ ) لەدەست چەنەبازی ( داخ ) لەدەست دەردەدل ، ( ئۆف ) لەو • هەلەوەڕیە ! ئافەرین بۆهۆشت ! ئافەرم باشت زانی !• ( خوزگە ) تاکسێیکم ئەکری ( کاشکی ) ماتۆڕیکم ئەبوو ( بـریا ) تۆش هـاتبایت • هەر نەم دیتبایە •••

هەروەها ووشەی تریش ، وەك !

تەقازا ، لەنەکاو ، لەخۆرا ، لەهێکەوە ، ناگەهان ، هێشتا . ئاوا ، ئاوها ، هەروا ، هەروەها . هاکا ، ئاخر ، باوەجۆ ، هەرمن ، هەرێ لەچلی تریش ، ڕەنگە ، لەوانەیە ، ئەشێ ، ناگونجێ : دڤێ ، ناڤێ . ببێو نەبێ دەبڕۆ ، دەبێ ، گەرەکنە ، پێویستمە . تکایە پێکەوە ، فێکرا . وێرای خەڵکی .. بۆ ناوی نادیاری هێندو گشتیش :

هەموو ، هەمی ، گشتی ، سەرجەم ، سەرانسەر ، سەرلەبەر . گەلێك ، هیچ ، هێندە ، ئەوەندە ، بڕێك . چکێك ...

## بەشی شەشەم ـ ڕستە

ڕستە واتە : قسە ، لە دوو ووشە یان زیاتر پێك دێت بە جورێك ڕیز بکرێن واتاو مەبەستێکی تەواو بگەیێنن .

ووشەی بنچینەیی لەرستەدا گوزارەیە ، گوزارەش دوو جۆرە :

١ ـ فرمانێك لەو شازدە فرمانەی ڕابران بەسەر بکەرەکەیدا بدرێ لەچاوگە فرمانیەکانی ( سادە ، داڕژاو ، لیکدراو ) ی باس کراو .

٢ ـ ووشەیێکی نافرمانی بسەپێنرێ بەسەر ( خاوەن ) دارایەکەی دا ، بەهۆی راناوی ( ە . ن . یت . ن . م . ین ) ی سەپاندنەوە ، کە بەهەڵە پێیان دەڵێن : فرمانی بێهێز و لەمەشەوە ، رستە سادەیان بەیەك جۆرە ڕستە داناوە ، هەر لەمەشەوە هاتوون زاراوەی ( نیهادو بکەر ) لەپاڵ زاراوەی ( فرمان ، گوزارە ) یان بۆ دوو ووشەی بنچینەمی ئەو ڕستەیە داناوە ، لاشیان وایە ، نیهادو بکەر یەك شتن ، گوزارەش فرمانە وەك فرمانیش گوزارەیە بەڵام کەزانیمان ڕستەی سادە دوو جورە : ڕستەی فرمانیو ڕستەی نافرمانی بۆچی سوود لەو چووار زاراوە وەرنەگرین : بێین زاراوەی بکەرو نیهادو ، فرمان و گوزارە ، تایبەت کەین بەرستەی فرمانی ، زاراوەی ئیهاد گوزارەش بۆ دوو ووشەی بنچینەیی تەنها ڕستەی نافرمانی بەکار بهێنین ؟! من دووای چەندان لێکدانەوەو بەراووردو هەوڵ دانی ڕێكخستنی زاراوەکان لەگەڵ ڕەوتی ووشەو ڕستەی زمانەکە بەدڵ

نیاییەوە دەڵێم : ئەم‌پێشنیارە باشترین چارەکەری گیرو گرفتی باس کراوە ، ئەوەشم لەیاد نەکردووە کە ئەمە ئەگەر لە پەروەردەدا پەیرەو بکرێ پێویست بەگۆڕینی بەرنامەی ڕێزمانی قۆناغەکان ئەکا ، ڕەنگە زۆر بەزەحمەتیش ئەنجام بدرێ جا بچینەوە سەر باسی ڕستە کە گوتمان دوو جۆرە :

جۆری یەکەم ـ رستەی فرمانی :

کەرستەکانی رستەی فرمانی ئەمانەن :

١ ـ نیهاد ( بکەری فرمانەکە ) سەربەخۆ بێ ، یا راناوی لکاوبێ ·
٢ ـ گوزارە ( فرمان ) سادە بێ یادارژاو ، یا لێکدراو ·
٣ ـ تەواوکەری راستەوخۆ : ( بەرکار ) ·
٤ ـ تەواوکەری بەیاریدەی : ( بە ، بۆ لە ··· )
٥ ـ ئاولفرمانی کاتی ( دەمکار ) ·
٦ ـ ئاولفرمانی شووێنی ( جێکار ) ·
٧ ـ ئاولفرمانی چۆنی ( چونکار ) ·

ڕستەی فرمانی لەسەبناغەی فرمانێك ( سادە ، دارژاو ، لێکدراو ) بەسەر بکەرەکەیدا پێك دێت · فرمانیش بێ‌بکەر نابێ ، بکەریش یا ووشەیکی ناوی سەر بەخۆبە یان راناوێکی لکاوە ، و نیهادەوەك · پایز داهات · هەور بەری ئاسمانی گرتەوە · سال دەگەڕێتەوە شەکر دەتڕێتەوە · زانست زۆر بووە · سەرخۆش زۆر دەخوا ، دوو شەش تۆپی · مانکەشەو خۆش بوون · گفتو گویەکەتان بەچی گەیشت · ئەم کاڵەکە باش گەیشتووە · من خۆشم ناوێ جا ئەو نموونانە ئەگەر بکەری ( نیهاد ) سەربە خۆیان لێ لا ببەیت دەبنە نموونەی ئەوەی راناوی لکاو بکەر بێ : بەری ئاسمانی گرت · دەگەڕێتەوە · خۆشم ناوێ ··· نموونەی تریش ، وەك : تێگەیشتم · دەموچاوت بشۆ · ئەتناسم · پڕبووە ، ڕاوەستە ·

ئەمجا فرمان‌و بکەر لەگەڵ ئەم ئاولکارانەدا :

أ ـ تەواوکەری ڕاستەوخۆ ، وەك :

ماتۆڕێکی باش بکڕە · دەرگایەکەم داخستووە · ئەوتاوانە بگۆڕە ·

ب ـ تەواوکەری بەیاریدە ( بڕوانە ئامرازی پەیوەندی ) ، وەك :

ناردوومەتە بەر گاڕانێ · بەچەکوش دای‌کوتــە · لــەهاورێیەکەتم وەرگرتووە · سەعات بەپیلیش ئیش‌دەکا · سەگ بەوورچ ناوێرێ · کاری تۆ بەمن سپێراوە · بەخوا درۆ ئەکا · بەپارە یارمەتیت ئەدەن بۆ چاپ‌کردنی · ئافرەت جگە لەکابانی ماڵ منالیش بەخێو دەکا · بۆ هەردوکیانیش :

چەپلە بەدەستێك لێ نادرێ · گەر بەکوتان تەمبێ نابێ · ژن بــۆ کوڕەکەت بهێنە · خۆت لەئێمە بەزلتر مەگرە ·· من ئەم باسەم لەگەڵ تۆدا نەکردۆتەوە · هۆرمز دداني بەدەرمان دەشوا قسەی ناڕەوا لەباوکی خۆشی قبول ناکا ·

ج ـ ئاولفرمانی کاتی ، وەك :

لەپاییزدا گەڵای دار دەوەرێ · شەوانی زستان یاری دەکەین جارێکیان کەلەشێرێك هێلکەیێکی‌کرد · رەمەزانان بەرۆژوو ئەبم · سەعات هــەشت دەڕۆم · هیچ ناوێکی فەرەنسیم لەوکاتەدا · ـ دوێنێ ـ بیرم نەبوو · پێرێ ئەموەختە زەماوند بوو ·

نەهاتەوەیاد · ڕۆژی شەممە پێکەوە دەچین · من‌و شــاسوار ئــەمرۆ گەڕاین زۆر لەمێژە ( دەمێکە ) نەت بینیوە · لەکەیەوە نەهاتۆتەوە ؟

د ـ ناوەلفرمانی شوێنی ، وەك :

نەهاتەوەیاد · ڕوژی شەممە پێکەوە دەچین · من‌و شاسوار لــەمرۆ هاتە کنم · لەسەر کۆنکرێت مەخەوە لەپشتەوە برۆ · لەئەوروپا دەخوێنێ · لەخوارێی دابنێ هەڵگورد لەتەنشینەوە ڕاوەستاوە · بۆکوێ ملت پێوە ناوە خلەش لەوێ دێتە لام · خدر لەلاێیکی باخچەکە ڕاوەستاوە هەرواش :

لەبن ـ لەژێر ـ لەناو ـ لەکن ـ لەلای ـ لەیەنا ···

هـ ـ ناوەلفرمانی چۆنیو چەندی ، وەك :

چەوو لم بەجیا دابنێ ۰ بەزەحمەت هەل دەپچڕێ ۰ بەگوێرەی پێویست بیان خۆ ۰ زوو بگەڕێوە ۰ کەمکەمە خەریکی وورده کارێك بـە بالنـدەکان پۆلپۆل ڕەو دەکەن ۰ سەگ وەك گورگ دەلوورێنێ سێ چوار جارهاتمه لات ۰ مارەکە دوو مەتر درێژ بوو ـ قوتابیـەکان چوارچوار ریزبـوون ۰۰۰ هەروەها : بـەفیزەوە ۰ بـەڕوو خۆشـیەوە ۰ بەپێکەنینەوە ۰ بەبێـوە ۰ بەدزییەوە ۰ دوودوو ، سێسێ ۰

بۆ نێکەلاو لە ئەوانەش :

پیاوەکە بەخۆرایی لەسەر وێری خۆی سەعاتێکی بۆ کوڕەکە کـڕی من لەمانی خۆم بەو لاوە داوای شتێکی ترم لێ نەکردوون کاك هۆمەر سالی شەستویەك لە خێزانێکی مام ناونجی لەدێی عەلیمەرای سـەر بەشـاری کەرکوك لەدایكبووە چەند نموونەیێکی ڕستەی فرمانی لەسـەر دیالێکتی سـەروو :

ڕاست لسەر ملێ خوە زڤڕی ۰ ڕەنگێ وی زەرو دامای بوو ۰ تاف چافێت وی تێك چوون ۰ لەرزینەك کەتە لەشی ۰ وەکی هێزکا داری لێهات ۰ زڤێ قاما جەهدێ دچوو قاما دی ـ ئەهریمەن بوو ـ کوڕێمن تاڤێ خـودێ بینە ۰ ئەهریمەن ـ کوڕێ من ـ چ ژتـە دڤیـا ! ۰۰۰ هـەرە ، ژدەریـایێ بڕەڤە ۰ ژئاگرێ ڕۆژێ خوە قورتالکە ۰ خوە درێژ کە ۰۰۰

هاتنو چوونا پەزی دهاڤینێدا پتر دهێتە کرن ۰ ئێڤارێ پەزی دئێننەڤە گوندێ ۰ کەسێ بێکارو بێخەم بچاڤ ناکەڤیت ژبلی ( جگەلە ) داکەفتیو زاروکان نەبیت بەرێ چەند رۆژ ژمارا تۆیا گوڤارا بهێژا وە ، من ستاند ۰۰

جۆری دووەم ـ ڕستەی نافرمانی :

ڕستەی نافرمانی بریتیە لەسەپاندنی ووشەیێکی نافرمانی ( نـاو ، ناولناو ۰ ناولبکەر ۰ ناولکراو ۰ چاوگ ۰ ژمارە ـ ) بەسەر خاوەنەکەیدا بەهۆی ڕاناوی ( ە ۰ ن یت ۰ م ۰ ین ) ی سەپاندنەوە ۰ ئەو وشەیە

( گوزاره )یەو خاوەنەکەشی ( نیهاد )ە ٠ گوزارەش هێندێ جار تەواوکەری هەیە : « ئاولگوزاره » نیهادیش زۆرجار لەئاردا نابێو ڕاناوەکەی جێگریەتی ، وەك :

١ ـ نیهادو گوزاره :

ژیان خۆشە ٠ کشتوکال سەرمایەی ژیانە ٠ کاوەو نالە ئاسنگەرن ٠ تۆ هونەرمەندیت ٠ بەهێ وەکو هەرمێیە ٠ قەزوان بەری دارەبەنە جەوت تامێکی تفتو تالی هەیە ٠ ئەویش بێسوود نیە من ڕەوشەنبیرێکی ئازادیخووازم ٠ ئێمەگەلێکی ڕەچەلەك پەرستین پێکەنینی خەندەکەت ئازاری قەبری منە ٠

٢ ـ نیهادو گوزارەو ئاولگوزاره ( تەواوکەر ) :

دەنگی لەتۆرەی سەگ ناسازترە ٠ ئێستا خێزانەکەم زرپو زیندووە دەنگی دەهۆل لەدوورەوە خۆشە ٠ ژین بەبێ خۆشەویستی بێتامە دووکەل لەهەموو مژاکێك بۆ لەش بێکەلکترە ٠ وەرزش بۆتەندروستی زۆرباشە زەحمەتە بێمەی ژیانم بەو دلەی تاریکەوە ( بێکەس ) ٠ کام تاسە ، کام مەیل ، کام چاوەنوارِی تەلسماوی‌یە وەك هی دلداری ؟=گۆران ٠

ڕستەی نیهاد فرێدراویش وەك ٠

ئاسانە ٠ گەورەن ٠ کەیفی خۆتانە ٠ بەڕاستتە ؟ بۆخۆی وەستایە جێژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی‌و بەهاتەوە ٠ هەورو بارانە ٠ لەمن پیر تریت ٠

لەدیالێکتی ژووروش :

لهەر گوندەکی لهەر شارەکی بهزارا ڕێنجبەرو جوتیارو پالەنە ٠ ئاڤێ تە چیە ؟ هەر کارەکی زەلاما خرو هەیە ٠ هندەك مێر بێکارن ٠ خودان ئەزمانێت درێژن ئەڤە وارێ کرێڤێ مەیە ٠ ئەڤە پەریەکە ژ پەرێیت ئاسمانێ خودێ ٠ خبەرا نجیر ژ شەکر چێژە ٠ ئاشتی بێ جرێف شەڕا خۆشە ٠ ئاگاداریی‌یەك لەسێ خالدا :

١ ـ ووشەی « هەیە » یان « هەن » سەر بەخۆ گوزارەیەو وەکو نمونەی « قەڵەوە » ، « ناخۆشە » ٠٠ وەهایە و هەمیشە سادەیە : خێزانت هەیە ؟

٢ ـ ووشەی « نیە ، نین » دوو باری هەیە :

أ ـ کەبگونجێ ووشەی « هەیە » ی لە شوێن دابنرێ وەکو : شیری لە « شیری‌نی‌یە » دا ئەگوترێ : شیری هەیە ٠٠ لەم‌بارەدا « نیە » وەکو « هەیە » گوزارەیە لەڕستەکەی خۆیدا ٠

ب ـ کە نەتوانرێ بخرێتە شوێن : ( هەیە ) ، ئەوسا « نە » پیتی نەماندنەو « ە » یەکش ڕاناوی سەپاندنە ، وەکو : لە : ( جگەرەیێکی بێ‌تام نیە ) دا چونکە : ( هەیە ) لەشوین : ( نیە ) دا ناگونجێ ناگوترێ : جگەرەیێکی بێ‌تام هەیە ٠٠ ووشەکەی پێش خۆی ، واتەناوو ئاوڵناوی : ( جگەرەیێکی بێ‌تام ) گوزارەمە ٠

٣ ـ کێشەی فرمانی بێ‌هێز :

وابزانم ئەوانەی فرمانی بێ‌هێزیان بڕیاد داوە ، سەیری تەنها ئەو نموونانە ریان کردووە کە راناوی گوزارەکە پیتی « ە »ی پیۆە بێ ، وەکو : پیرە مەگروون بەرزە ، کێوە فێنکە ٠٠ واتە : وایان زانیوە : بۆ فرمانی بێ‌هێز تەنها پیتی « ە » هەیە ، ئەوسا وا حاڵی بوون کە ئەو « ە » یە کورتکراوەی « هەیە » یە ، نەیان زانیوە کە پیتەکانی : (ن ، یت ٠ م ، ین ) یش هەن وەك : بەرزن ٠ تووڕەیت ٠ شادین ٠٠ ئەمانەش بەهێچ پێچو پەنایێك ناشێ فرمانی بێ‌هێز بن ٠

جگە لەوش بەڵگەی تر هەیە لەسەر نادروستی ئەم بیرو بڕیارە :

أ ـ گوزارە ئەبێ ووشەیێکی زەقی واتادار بێ ، مانـاکەی بسەپێ بە سەر نیهاددا ئاشکراشە ئەوەی وایە ووشەکانی ( بەرز ، توورە ، کێو ، فێنك ، شاد ) ن ، نەك راناوەکانی ( ە ، ن ، یت ، م، ین ) ٠

ب ـ هەر ئەو راناوانەشن دەچنە پاڵ فرمانەکانەوە : ( بـووە ، بـووم ، بوویت ، بوون ) جا کە فرمان بان جۆن فرمان دەبێتە بەشێکی فرمانی تر ؟ یا چۆن فرمان شوێنی ( بکەر ) دەگرێ ؟! ٠

ج ـ لە گەردانی فرماندا ڕیزەیێکی تایبەتیان نیەو وەکو ئەوان لەقەدو رەگی چاوگ بەبارمەتی نیشانەکان دروست نابن ، بۆنموونە : لەگـەردانی فرمانی : بوو ، دەبـوو ، بـووە ، بووبوو ، بووبێ ، ببـا ، دەبێ ، دا جێگەو ڕیزەو شوێنەوارێکیان نیە ، ووشـەی ( هە )ی ( هەیە ، هەن ) نیش فرمان نیە بەڵکو واتای « بوون » ی هەیە و وەکو ووشـەی ( کەم و زور ) وایە ٠

د ـ لەرێزمانی عەرەبی‌دا بەرابەر بەووشەکانی پێشـوو ئەم ووشانە « جَبَلٌ ، رفعة قليل ٠ كثير ٠٠ هەن ، ئەوانەش خۆیان گوزارەن نەك راناوی پێوە لکاو ، یان شاراوەیان ٠٠٠٠

کۆ بوونەوەی بکەر ( دوو نیهاد ) :

لەکۆ بوونەوەی دووان یازیاتر بەپلە دیاری دەکرێن ، وەك :

نیمە : ( نیهاد /١ ) میوانمان : ( نیهاد/٢) کەم دێن : فرمانی لێکدراو ، داهاتوو ٠ کاتژمیرەکەم : ( نیهاد/١ ) میلەکانی : ( نیهـاد/٢ ) بەشـەو : ئاوڵفرمان ٠ دەدرەوشێنەوە : فرمان دارگوێز : ( نیهـاد ـ ١ ) قـەدی : ( نیهاد ـ ٢ ) زۆر ئەستورە : ئاوڵناوی لێکدراوە ، گوزارەیە ٠ ئەم درەختانە : ئاوڵناوی راستەو خۆیە ( نیهاد ـ ١ ) گەڵاکانیان : ( نیهاد ـ ٢ ) زەردە : گوزارە هێندێ کەس : ( نیهاد ـ ١ ) لە ژیـاندا : ئاوڵـگوزارە بـەشی : ( ن ـ ٢ ) خواردن ونوستنە : گوزارە هەروەها دوو فرمان یا دوو گوزارەی ڕاستەو خۆش بەپلە دیاری دەکرێن ٠٠

ئاوورێ دانەوەیێك :

ئەگەر لەڕستەی نافرمانی‌دا ڕاناوەکانی ( ە ، ن ، م ، ین ، یت ) ی لکاو گوزارەو فرمانی بێ‌هێز بن ئەوسا ئەم ڕستەش ئەچێتە گەڵ ڕسـتەی

فرمانی ، ئەوسا هەردوکیان بە ( ڕستەی سادە ) ناو دەبرێن بەرامبەر بەرستەی لێکدراو ، ئینجا دەتوانین زاراوەی ( نیهاد ، بکەر ) بژووشەی یەکەمی بنچینەیی هەروەها زاراوەی ( گوزارە فرمان ) بژووشەی دوەمی بنچینیەکەی رستەیی سادە دابنێین ئەوسا لەشی کردنەوەدا دەلێین :

چالەکە : ناوە ، نیهادە · بکەرە · پڕبوۆوە : فرمانی لێکدراوە · گوزارەیە · دڵ : ناوە · نیهادە · ئاوێنەی دڵە : ئاولناوی بەیاریدەیە · گوزارەیە ه : فرمانی بێهێزە بەڵام من ناتوانم پێی بڵێم : گوزارەیە ·

چەشنی دووەم ـ ڕستەی لێکدراو × ( ئاوێتە ) :

ڕستەی لێکدراو لەتێک خستنو لەیەکدانی دوو جوورە ڕستەی سادە پێك دێ کەبەبێ یەکتری واتاو مەبەستی تەواو نەبەخشن ·

ئەولێکدانەش هێندێ جار ڕاستەوخۆیە وەك :

من ئاغاو تۆ ئاغا × کێ جێمان بۆ داخا ؟ دار لەگەڵ تۆمە × دیـوار گووێت لێبێ یا بە هۆی ئامرازێکی ڕستە لێکدەرەوە بێ ، وەك :

( ئەگەر ( گەر ، ئەر ) ، کە ، هەرکە ، هەرچی ·· تاکو ، هەتاکو ·· بوێ ، چونکە ، لەوەتی ، لەوساوە ، هێندە ، ئەوەندە ، وەك ، وەکو · و ، ێ ، ئەوـی ·· ) لەبەشی زۆری نموونەکاندا ڕستەی یەکەم بە ( بەشی نیهاد ) دا ئەنرێ · ڕستەی دووەمیش بە ( شاڕستە ) و ( بەشیگوزارە ) · ڕستەی ئاوێتە بەپێی چۆنیەتی پارستەکەی شەش یاپێنج جۆرە :

١ ـ ئاویتەی تەواوکەری :

لەزمانەکە فرمان خۆی دەبێتە تەواوکەری فرمانی رستەخوواز یـا ووشەی رستەخواز ، فرمانی رستەخوواز وەك :

گوتی · بینی ، دیتی ، سەیر یا تەماشای کرد · دیقەت یا سەرنجیدا · هەستیکرد ، بیستی ، زانی ، توانی ، تێگەیشت ، حاڵیبوو · دەرکەوت

لێگەڕا • وازیهێنا • پرسی • ڕایسپارد • ویستی • نەیهێشت • خواستی • دەبێ ، نابێ ••

ووشەی ڕستەخوازیش وەك : باشە • شەرتە • پێویستە • دیارە • وادیارە • ئاشکرایە • لەوانەیە • رەنگە • خەریکە • باشوایە ••

جا لەبەر ئەوەی فرمانە ڕستەخوازەکە لەگەل ڕستە تەواوکەرەکەیدا بەدوو ڕستە دائەنرێن دروستوایە بەرستەی لێکدراو بژمێرێ بەناوی : ئاوێتەی تەواوکەری ( بەرکاری ) وەك :

دانیشە × پێتبلێم • ووریابە × نەکەویت • پێموایە × مانگ (٢٩) یە دەلێن : کیسەل سەدسال ئەژی • سەرهەلبرە × بروانە • بزانە × باران دەبارێ ؟ کوڕ ئەوەیە × لەم دەریایە بپەڕێتەوە • حەزەدەکەم × سەرێکمان لێبدەیت پیاوی زانا ئەوەیە × بێبیرکردنەوە هیچکارێك لەخۆیەوە نەکا • ئەزانم × کێ تەفرەی داویت • بەئاواتەوە بوو × لێیان رزگاربێ تێم بگەیێنە × درۆی چیم لەگەلدا کردوی ؟ دلم نایێ × ب تە را مشەر بکەم تەماشا کر × زەلامەك لەوێ رۆنشتیە • ملەتێکورد دخوهنری × بسەربەستی بژی • شەرتبێ ئەزتە بخوهرا نابم • دکتۆر فیا چافێ وی عەمەلیات بکەت • کەس نەوێرە × هەرەجەم وی • باشە × ئەف نافانەکی باسکرن ؟

ئاگاداری :

دەتوانرێ پارستەی ئەم لقەبەتەواوکەر دابنرێو لقێك نەبێ لەرستەیلێکدراو •

٢ ـ ئاوێتەی حالی :

پارستەو شاڕستە بەهۆی (و) حالیەوە چەسپ کرابن ، وەك : تەلاقم بدە ( و ) هەشت دینار وەرگرە • کێرا بوومە مێردت ( و ) کوێرا تەلاقم دایت ؟• دەست لەدەست ( و ) هێز لە خۆرواوە • دۆم بێ ( و ) کەلاش بۆخوێ بکا • کەری خۆمە (و) گوێیانی نال دەکەم یان گال دێ یان پەمۆ • چبارەکە بەرێتە لایکەرەکەو چکەرەکە بەرێتە لایبارەکە •

نە ئەو هیلکەو رۆنە نەئەم زەبرە بەڤوونە ٠ سەرێکە هێناومەو نایکێرمەوە دوواوە ٠ مانگ بەحەواوەو گۆزەڵە بەڤوونەوە نەمیسر ناس‌دکەم‌و × نەئەزیش ملڤێ قزل پاشام ٠ سەراڤێ رشەو × ئاڤا وێ شیرنە ٠ ئەڤرۆ لڤێرەن‌و × سۆبەی لجێیەکا دین ٠٠ ژهنگڤینێ شیرنترەو ژمزا گرانترە ٠ هەرۆ دەیکاتەئو × کۆمەکا ٠ هێکا دکەت ٠ لتاڤێ ددن تەر نابی‌ئو × لکەڤری ددن کەر ( کەرت ) نابی ٠٠

٣ ـ ئاوێتەی کاتی :

پارستەکە جۆرە کاتێکی گوزارەی شارستەکە بێ ، وەك :

کە لەخەو هەستایت × دەم‌ودانت بەفلچە بشۆ ٠ کەهاتیتەوە × خەبەرم بدەرێ ٠ کاسەکە پڕبوو × لێی‌دەرژێ ٠٠ کەپیشیلە لەماڵەوە نەبوو × مشکان تلیلیانە ٠ پیاوکە زۆری گوت × خەراپیش ئەبێژێ گوو تاداری تێوەر دەیت × بۆنتر دەکا ٠ کوێر تادەمرێ × هەر بەتەمای چاوە ئەوەندەم بەسە × تاکسیەکی پێ‌بکرم ٠ ئەوەندە پێکەنین × هەموویان کەفەزگ حەتا هەڤا لوێ کونێ ڤەبێت × نی تێکرە نەهەوژێت ٠ هتا من بەرێ خوە ستاند × سەرا هێژ بی ٠ کو برێ تە ڤەگەرا × بمیڤانی هاتنەکا ماڵا مەبکەت لەورا کو دەما زغەیب ڤەك بوو × تەئریخ هەزارو شەست‌و یەك‌بوو حتا رێبەرا مە زوراغا بی × خاینیا مە ئاڤا نابی ٠ هتا مەلێ مەلێ‌بی × ئیڤرە بڤار نەبی نەهین × هتا دگەڵ وە تەلفوونێ نکەم ٠ حتا خانی خوە نەفروشم × ئەز ناچمە گوند ٠

٤ ـ ئاوێتەی ڕەوشی ( وەسفی ) یا ئاوڵناوی :

پارستەکە جۆرە سفەتێکی ( ئاوڵناوی ) نیهادی شارستەکە بێ ، وەك :

ئەوکەسەی بێ‌کەس نیەو خانە خەراپ × دەك بەژەهری ماری بێ بادەو شەراب ئەوەی زۆر بخوا × زۆرتر نازێ ٠ ئەوەی ببێتە سیخوڕ × دەبێتەپردیش بۆنەیار ٠ ئەوەی لەمشك‌بێ جەواڵ ئەدرێ ٠ دێیەکە وەك باسیان بۆ کردووم × جێێکی خۆشە ٠ ئەوانەی وەکو تۆ بیردەکەنەوە × زۆر وریان

چاوێك بەر پێی خۆی نەبینێ × کوێرە · دەستێك نەت توانی بیبڕیت × ماچی‌بکە · سەیرانێك منی تیا بەشدار نەبم × بەسەیران ناژمێرێ ؟ لەم جۆرە ڕستە لێکدراوەدا نموونە هەن رستەی یەکەمیان شارستەیەو بەشی نیهادە ، وەك :

ئەو شووێنە خۆشە × باخچەو درەختی هەبێ · بەپێیان هاتوو چۆی ئەو شووێنە دەکەم × کەدەرسی تیا ئەلێمەوە · کاریکی پێ‌کرد × با بەدەواری نەکا ئەوە کەسێك × ئەوتەلیسمەم بۆ بشکێنێ · ئاگری نەورۆزی کاکەلاو لەشاردا کەس‌نەما × سەرنجی لەبالآی نەئالێ · ئەوەم بدەرەوە × کەدوێنێ لێمت وەرگرت ··

نموونەش لەزاری سەروو :

بەرێ زارۆکی ڕەش یی لدایکا خوویە × هاریکاریا وی دکەت · من چ بو نەدکر × وەکی وێ دڤیا · چ ستێر ژئاسمانی‌بکەڤنە خارێ × دێ هەمی بسەر تەدا بکەڤن · ئەڤ دلێت هێڤی و ژین تێدا دیارکرن × لدەور روخێ خوو گێراندن سیارێ ب‌تنی راکەتە × نوزی ناکەت ·

٦ ـ ئاوێتەی مەرجی ( شەرتی ) :

پاڕستەکە جۆرە هۆیێکی گوزارەی شاڕستەکە بێ ، وەك :

هەشت‌سال رەنجبەریم بکەیت × کەنیشکی خۆمت ئەدەمی · بەتەلآقم ! ئەگەر نەم زانیایە گوێرڕێژیت × شلکوتی لیسم ئەکردیت · کەگوێ نیت × بۆچی لێم‌بوویتە درك ! کە ناتوانیت بزێیت × بۆچی کەڵ ئەگرێت ·

هەر لەگردەکە ئاوابیی × بەسەر دێیەکەدا دەکەویت · هەر کە لێ‌بوویتەوە × یەکسەر وەرە لام · هەرکەسێ زۆر بخواتە × سەری نەڕوتێتەوە · هەرچی گا بیکا × گا نایخوا · هەرچەند هاڕەی بێ‌هەیاسەی جۆانێ × لەهیلانەی دڵ دەفرێ ئاواتێ هیشتا لەنووسینەوەی نەبوومەوە × داوام لێ دەکەن بەچاپی بگەیێنم بۆیی پێت دەڵێم : من‌ئەتپەرستم × هەتاکو دەستت بخەیتە دەستم (م) · هەر جوارمان نموونە زان بین × باشترە لەوەی هەمووما

یووچزمان بین هەرکەسەك هاوسەرا خوو نەبت × بناشکرا عومرێ وی گوزەشت بییە · هەکوتوو هاتی مالامە × ئەزیش دهێمە مالابابێتە · ئەگەر ئەو بچن × ئەو دێبینن · هەکە منەدیتبا × ئەز دچووم · تماشایی خوو و کرنا وی بکەن × بێ جمەت ل دەورا وی پێك سوونە ئەگەر ئەم چووبان × ئەو نە ددیت · هەچی ل نوالێ کورا کەفی × وێخەونی خوهش ببینی · چقــا گەفرێ لسەر زووی هەنە × هەمی نزاچیێ منو تەنە کوو من نەبوویا × دفی چ بسەری تە بهاتبا ! کوو ئەم ل دویف وانرا هەرین × هەتا سبەی دگەین یوان · وەکی کوردان جارەکی پەزەك ببینن × پاشێ بیست سالا ئەڤ پەزە فەناسن · سەمەدێ چاڤێ تە نەبا ئەز نە دهاتم · ئارام چوو بازێری ، کوو درگەهێکی مەزن لۆ کۆشکا خوو بکرەت ·

سەواداری بەرێز : جۆرە ڕستەیێك هەیە پێی دەڵێن : ڕستەی هەڵوێستەیی ( الجملة المعترضة ) ئەویش هەرچەند ڕستەی سادەیە بەڵام چونکە دەکەوێتە ناوبەینی ووشەی ڕستەیێکی ترەوە شێوەی ڕستەی لێکدراو وەر ئەگرێ بەڵام لەشی کردنەوەدا وەکو ڕێزمانی عەرەبی سەلماندوویەتی : نابەسترێ بەڕستەی تێ کەوتووەکەیەوە جا لێرەدا شتێك روون دەکەینەوە :

ڕستەی هەڵوێستەیی ( ڕستەبڕ ) :

جاری وا هەیە ڕستە یا نیمچە ڕستەیێك دەخرێتە ناوبەینی ڕستەیێکەوە یا دەخرێتە نێوان ڕستەی ناوێتەوە بۆ تێبینیەکی وەك : نزا · نووك · پاراستن · بۆ وێنە :

خووا کاری راست کا · خووا ئاگاداری بێ · حاشا حازری · حەز بکاو حەز نەکا · بێتۆ ناخۆش · دوور لەتۆ · سەرت نەئێشێنم · وەك :

ئەو زەویو زارەی هەیانە ـ شوکر بۆخووا ـ گوزەرانێکی باشی پێ دەکەن ئەو هەتیوە ـ رووی ڕەش بێ ـ درۆی لەگەڵتا کردووە ، ئەو رۆژە ـ سەرت نەئیشێنم ـ ئەرسەلان گەیشتە کێوی سونگاران خەوو خواردن لەلای ناری بەبێ تۆ ـ دوور لەتۆ ـ وەك زەهری مارە بەریەکەی کانی نەوتم دەمێکە

ـ ئاخیری خێر بێ ـ بێسەرو شووێنە منیژ گەلەك ـ نیرگزا من ـ لدویف دکرگازی ، لێ ئەو هێڤیە ـ بخازی یا نەخازی ـ گەلەك کەفنە ، بێ بیست سالە ، نەئی پارو نەپێرارە ·

تیبینی :ـ

رستەی لێکدراو هێندێجار لەپتر لەدوو رستە پێك دێ ، وەك :

ئەمردم من ـ ئەگەر ـ ئەمجارە بێتۆ × ئەچم × ـ شەرت‌بێ ـ هەتا ئەم خوارە بێتۆ لەگەل دل شەرتە « سالم » × گەر ئەجاتم بێ لەتارانی × بەهەشت گەر بێتە دەشتی « ڕەی » × بەئێرانا گوزەر ناکەم « سالم » ·

شی‌کردنەوەیێك :

**پاڕستەو بەشی‌نیهاد :　　　شاڕستەو بەشی‌گوزارە :**

وا فێربووین مالآنگەڕی　　×　　سەگ پێیان نەدەوەڕی

**شاڕستەو بەشی نیهاد:　　　پاڕستەو بەشی گوزارە :**

ئەو شووێنەم لەلاخۆش‌و دلگیرە × دلم لێ رەهای وەسوەسەی پیرە

بەستنی ڕستە بەڕستەوە :

شتێکی ئاسایی باری زمانەکەیە : زۆر ڕستە بەبێ ئامرازی تایبەتی دەدرێنە دەم یەکەوە ، وەك :

لە کۆختەیێکی کەنار دەریای گافیل دا پیرەمێردێك هەبوو · هیچ هاوسەرو کەس‌وکاری نەبوو ، بەتاقی تەنیا لەو ناوە ژیانی بەسەر دەبرد هەمیشە خەریکی ڕاوەماسی بوو ، لەماسی بەولاوە هیچ خواردنیکی‌تری نەبوو ، هەرچیەکێ لەبەری بمابایەوە دەیدایە سەگەکەی ، ئەوسەگەی زۆر خۆش دەویست ، بۆهەرکووێ بچوبایە لەگەل خۆی دەبرد ···

نەبەستنی ڕستە بەهۆی ئامراز بەیەکەوە لەهەموو بارێکدا ناچێتەسەر چونکە ئامرازی لێکدان‌و بەستن بەنارەوایی لەزمانەکەدا جیگیر نەبوون‌و هەریەکە شووێنی‌لەباری خۆی هەیە ، ئێمە بەشێکی ڕستە لێکدەرەکانمان

نووسیون ، لیرەشدا بەشی گرنگی ئامرازی ڕستەبەست بەڕستەوە پێشان ئەدەین :

١ ـ (و) :

سالێ سێمانگ لێرەیە (و) مانگەکانیتر لەدەرەوەی وەلات بەسەر ئەبات ،
سویچی جیبەکەم لەگیرفان دەرهێنا (و) بەرەو خورەمشار پێم پێوەنا ٠
سەعاتی کاکە خولە لەدەستما شکێنرا (و) زیانی چەند دینارێکم لێدرا ٠
سێچوار کەس شتومەکیان دەفرۆشت (و) کاری کڕیارەکانیان جێبەجێ دەکرد
جلوبەرگی بوشتووم (و) خزمەتی زۆری کردووم ٠٠

لەسەر سەکۆیەکە راکشابوو (و) سبۆخۆی خەوی لێ کەوتبوو ٠

لەوانەیە پێش نێوەڕۆ ئیشی کردبێ (و) ماندوو بوو بێ (و) خەوی لێ کەوتبێ دەمەوێ کۆشکێکی تازە بکەمەوە (و) ئەوەی خۆم بەکرێبدەم بەیانی ئەندازیارێ دەهێنمو خۆشم یارەتی ئەدەم ٠

٢ ـ ( و ، ش ، یش ) :

من ڕۆژی سەعاتێك پشووم هەیە ئەوسەعاتەش نیوەی بەخەو دەبەمەسەر ئەوپیاوە سویسرییەو باش ناتوانێ بەئینگلیزی بدوێ ٠ چلو نیوێکە ئەژیم بەوتەمەنەش چلی لەنەگبەتی یەکێکدا بەفیرۆ چووە ٠ ئاراز قەلەوە ، برایەکەشی وەکو خۆی قەلەو بووە شووانەکە ٠ مەرەکەی دایە پێش ، سەگەکەش بە لۆژەلۆژ دووای کەوت ٠ ڕێوی ئاهی مانگی نەمابوو منیش لەملاوە خۆم لێ مەلاس دابوو بریا خانوەکەم یەکقات بوووباو لەبری قاتەکەی تر قەمەرەیێکم کربیایە رەنگە بلیتێکم گرتبێتیو چەند سەد دینارێکم بۆ دەرچووبێ تۆ چێشتمان بۆ لێ بنێ منیش چاتان ، بۆ ساز دەکەم ٠

هەلبژاردنی کابرایەکە مسەوگەر بوو تالەی قوڕبەسەریش دەم لەپووشبوو ٠

٣ ـ ئنجا ، ئەوسا ، هنگێ :

خانوو دروست بکەو مال پێکەوە بنێ ئنجا سەیارەی لێ بکرە ترشەلۆك

چل ڕۆژ لەپیپدا دەمێنیتەوە ئەوسا دەبێ بەترشیات ٠

٤ ـ تا ، تاکو ، با ، بەڵکو ٠٠ :

توێتاڵیکی لێبکرە (با) لەدەست سەیارەی خەڵکی رزگارت بێ لەکاتی نوستندا هەردوو چاوی دەبەستێ تاکو خەونی ناخۆش نەبینێ ٠

٥ ـ ( کەچی هێشتا ) :

داوای وامی خۆمی لێ دەکەمەوە ( کەچی ) قسە یەلاێیکی دیکەدا دەبا دەمێکە لەسەر ئاگرم داناوە ( کەچی ) هیشتا نەبرژاوە ٠

٦ ـ هەروەها ، کەواتە :

بارانەکە سات بەسات بەتاوتر دەبوو ( هەروەها ) کلۆ بەفریشی لەگەڵ دەهاتنە خووارێ ٠ چەند هەزاریکم پێکەوە ناوەو لادا گران بووە ، ( کەوابی ) باڕاوەستم تا نرخیان دادەبەزێ ٠

٧ ـ نەك ، نەوەك ، ناکا ، مەبادا :

راوەستە ، بەناو گومەکە مەکەوە ( نـەوەك ) سـەیارەکەت بچەقیتـە قوڕەوە تازووە با قەباڵەی زەویەکەی پێ مۆر بکەم ( مەبادا ) لێم پەشیمان بێتەوە بەچدا دەزانێ : من بووم ؟ ( ناکا ) بمناسێ ٠ بەتەنیا مەچۆ ( نەوەك ) بت خەڵەتێنن ٠

٨ ـ بـەڵام :

خاکی باب‌و باپیرانیان لێ سەنراوەو دراوەتە دەرەبەگەکان ( بـەڵام ) ڕوژێك دادێ ئەو خاکەیانلی بسەنرێتـەوە بدرێتـەوە دەست خاوەنەکانیان من دزیم نەدەکرد ( بەڵام ) مامم جارو بارخۆی وون دەکـردو لەولاوە بـــە جارۆکەیە گوڵەبەرۆژەو دەهاتەوە ٠ وەرزهاوین بوو ( بەڵام ) تەڕو تروشی وەرزی بەهاری هەر مابوو ٠ مرۆڤ لەوانەیە بشکی ( بەڵام ) قەت نابەزێ ٠

٩ ـ دەنا ، ئەگینا ( ئەگەرنا ) ، ئەینا :

باری ئابووریم گزە ( دەنا ) بەچاپم دەگەیاند ٠ هەتیوەکە دوور کەوتبۆوە ( دەنا ) باشم تەمبێ دەکرد ٠ ڕەنگە کوڕەکەت لەوێ ژنی هێنابێ ٠ ( ئەینا ) دەمێك دەبوو دەهاتەوە ٠

١٠ ـ مەگەر ، مەگین ، ترمەز ، تەنانەت :

بۆ چاکو چۆنێیکمان لەگەڵ ناکەیت ؟ ( مەگەر ) نامان ناسیتەوە؟ ئاکم بەشداری قسەکانمان ناکات ( مەگەر ) ئەوزەوقی ئۆتۆمبێل کڕینی نیە ؟ کاتێ ئوتوورچم لی‌گرت هیچی نەهێشا ( ترمەز ) جلی‌زۆری لەبەردابوو ، دەستم لەئەندامی گیرنەبوو ·

١١ ـ چونکە ، بۆیێ ، خۆ :

دایەنەکە کە ئەم‌قسەی بیست تاسەیێك بردییەوە ( چونکە ) بۆی دەرکەوت کە کچەش کوڕەکەی ئەوی خۆش دەوێت· ئەبێ بزانی چۆن ئەیدوێنێ ( چونکە ) دڵی زۆر ناسکەو لەخۆیەوە تووڕە دەبێ ·· گەورەم ! پێم وایە سی‌بەلاوە کەمە ( بۆیێ ) وەری ناگرێ لەمەولا دەبێ بچینە خروار ئابلاخ زەوی بکڕین ( چونکە ) لەناو شاردا شوێنی خانووی گەورەکەم ماوە · ئێرە ناشوێنێکی تر ( خۆ ) وەختە مێشکم بڕوا ·

جگە لەوانە ئامرازی تریش هەن بەسەرنج لەنوسراوو بیستراو ئەدۆزرێنەوە هێندێکی کەمیش لەو ئامرازانە وەکو ( چونکە ، هەروا ، بۆیێ ·· ) بەپێێ نیازی قسەکەر بۆ باری لێکدانی دوو ڕستەش دەست ئەدەن ·

هەندێ نموونەی ڕستە بەستراو بەیەکەوە بەئامراز ، لەزاری سەروو :

بابیرا من سڤك‌و باەز چوو کلۆزێ دا کرو دانا سەر ملا خۆ‌و ریێاماڵ گرتەبەر هەمی شەڤان سەیێ بەرماڵ دهاتە ژوورڤەو ل جهێ خروەدا دکەت · پیرەژن چوو وەداخێ و لەڤ دێڤرا درگە داڕێخست ··

برایێ درکێ کوڕك هاڤیت بکەڤرەکی مەزنی دادا کورك ئێکسەر پەڤی و چوون کاڤر هاتە سەر کەلەخێ کورا خۆ‌و ، کاڤریش ژقەهرا داپەقی ، ژنبرازێ ژترسا دامری ئێك ئاڤەکا گەلەك سار بسەرامن دا کر من ژێ گەلەك ژوی تروێرە بووم ( بیم ) ئەڤا کتەبا چاپکرێد مە راشاند وەکی بفرۆشن · بچوو مالا زوراب بەلکە ل ماڵبن راستە ئەز رێبارم ، سەربێ دچم ، لێ شەنگێ تە مە تاس کرن نەشێانم ببزڤم خانزادی سۆرا حەز نەدکر

مێر بکەت چکو نە دخو هست کەسەك سەر ویرا فەرمانێ بکەت ·
دەست پێکا زفستانێ نەهخووشە ژلەوار دەما وەرهانو مرنێیە !
لە ( رێزمانی کوردی بەهەردو دیالێکتەوە روەرگیرانن ك · موکریانی )
ئاڤنگەکی خوەدانی بەرو چاڤا وێ ڤەر ببوو وەکی خویسارا بهارێ
ژێهاتبوو · دادێ زوی بە دا نانەکی بخووم · ئەفرۆ لڤیرەم‌و سوبە خودێ
دزانیت لوکێرێ دچم ( پەیف/١٩٨٠ ) · دەڤ ژ هەڤالێ دل رەش بەردە ئانەنە
خەلك دێ بزانن تووکیبی ژوی سەری گەرێ‌و چوو وی سەری هەتا هەمی
کادێت خوو هاڤیتینە گەرێ‌و ژەگەریا مالا خووە ·

بەسەر داهاتنەوەیێک :

قسەو ڕاوێژی تەواویان دەربڕینی رازو مەبەستی دەرونی بەتاکە
جۆرە رستەیێك پێك نایێ بەڵکو هەموو جۆرە ڕستەکانی باس کراو ( رستەی
سادە : نەبەستراو و بەستراو ، رستەی لێك‌دراو ) کەم تا بە زۆر بەشداری
ئەکەن لەتاودانی قسەو گوفتوگۆ و ئاخاوتن‌و نوسین‌و خوێندنەوەدا ، لەبەر
ئەوە ئەونموونانەی ئێمە هێناومانەوە لەبەرایی باسی ڕستەدا تادەگاتە ژێرە
کەم‌و کورت‌و ناتەواو دێنە بەرچاو چونکە ڕاوێژی تەواو نیشان نادەن‌و
مەبەستێکی واژەیی ( عبارة ) ریك وپێك ناگەیێنن تەنانەت هیچ کەسێك
ناتوانێ ئەو ئامرازانە لەراوێژێکی یەك دوو لاپەرەیی‌دا بەکار بهێنێت ·

لەسەر ئەوە بۆ هەردوو دیالێکتەکە دووپارچە نووسراوی رەوان
ـ ئەگەر چنگم بکەوێ ـ لە بەخش‌و هۆنراوە دێنمەوە تا بە وورد
بوونەوە بەراوورد لەگەڵ جۆرە رستەکانی باس کراودا بتوانرێ جۆری
هاوبەشی کردنی رستەکان و ئامراز لەو ئاخاوتنانەدا دیاری بکرێ :

نموونەی یەکەم : ( جوانی ی سروشت ـ گۆران ) :

بەئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە
لەباخچەی بەهار گوڵم چینوە
شەونمی درەخت لەرووم بژاوە
لەزەردی زۆر کەل سەرنجم داوە

پەلکـــە زێـــڕینەی پـــاش بارانی زۆر
چـــەماوەتەوە بـــەرامبەر بـــەخۆر
بـەهـارو نـەورۆز مـانگی جـــۆدرەو
زۆر هاتوونو چـوون بەرۆژو و بەشـەو
خوڕەو قەلبـەزەی کـەف زێوینیچـــەم
لەهەزار چەشنە پرشـنگی نـاو تـــەم
میوەی گەیشتووی زەردو سـووری بـاخ
جـریوەو جـووکەی دارستانی شـــاخ
لەگـــەرووی شمشال لەتەلی کـــەمان
هەڵـاوە گـەلێ ئاوازی جـوان جـوان

نموونە (٢) ـ بەرپەڕێك لە کتێبی گێلە پیاو وەرگێرانی عبدالله حسن زادە ـ :

دەمزانی : ئەگەر بەرەو ئەستەمبوڵ برۆم دەگیرێم ، لەبەر ئەوە بڕیارمدا لەسەر جادەی قیر بگەرێمە دوواوە ، بۆ ئەوەش جێ شوویێنی گەڕانەوەکەم دیارنەبێ کەمێك چوومە پێشەوە ئەوسا هاتم بام دایەوەو بەرەو ئەو شووێنەی لێیەوە هاتبووم پێم پێوەنا کاتێك دەپانزە کیلۆ مەترم بڕی لە سەر هەڵدێرێك رامگرت هەرچیەکی تێیابو هێنـامە دەرێو سـووتاندم ئەوسا خستمەوە گەڕو ترند پالێکم پێوەنائیتر هەر لەحەواوە هەڵرون بەهەوڵروون بـوو ٠

نموونە (٣) ـ بوهار احمدی نالبەند ـ :

بکە عیبرەت کو چەوا چرخو فەلەك بەنیـرادا مەلیـکێ حـەق عـەملی جنة الخلدە مەدیت هاتیە خار دل زەلال بوو مە ژئاڤا غەبلی ٠ نەقشێین دارو گیا فەیزە دەگەل هەرکولیکەك ل جهێ خۆشوفەلی تەیرو وەحشـا کرە نالینو ففان هەریەکی صوورەتەکێ پی ەوصلی سیستا چاڤ ڤەکرن دل هەڕشـاند عاشقا پێتو گوڕێ بەربوو دلی ( هۆنراوەکە درێژە ، لاپەرەیەك زیاتـرە ، لەبەر ئەوە وازم لێهێنا ) ٠

نموونه (٤) ـ چیرۆکا « درکێ » ـ احمد عبدالله مصطفی/بەیف/١٩٨٠ ـ :

دبێژن جارەکێ پەیایەك ( پیاوێك ) هەبوو خێزی کچەکا شەنگ ، ناڤێ وی درکێ بوو ، ژنبرا درکێ گۆتێ : رابە را بچینە بالاڤێ لەسەر رویبارێ . درکێ رابوو جلکێد خوو لێکدان ، کرنە تەشتەکێو هەردوو ئێکرا چوونە سەر رویبارێ جهێ بالاڤێ .. کافرەك ژدویردا هاتە خار بەرێ خۆدایێ کوو ژنکەك ل بەر لێڤا ئاڤێ ، لناڤ بەرا دوو بەرا راوستایە ، کافر چوو و هەلگرت و ژ خوەرا برە مال ( شکەفتێ ) لڤێ دەرمانەك دا بەر زتنێ درکێ هشیار بوو ، ساخ بووڤە ، برو ب ژنا کافری رۆژ پێڤە چوون خۆدێ کورەك دا درکێ ، کورێ وی مەزن بوو ، پیاکەت .. ( چیرۆکەکە درێژە ، بەکورت کردنەوەش جێی نابێتەوە ، بۆیێ وازمان لێ هێنا ) .

## گیروگرفتی زاراوەی رێزمانیو چارو پێشنیار :

١ ـ زاراوەی ( ئاوڵناو ) :

ئاوڵناو وەکو زاراوەیێکی رێزمانی بۆ چەند جۆرە ووشەیێك بەکاردێ .

أ ـ سیفەت ، وەك : ووشك . بچووك . قورس . شل . سارد . بەمە دەڵێن : ئاوڵناوی چۆنی .

ب ـ ئاوڵناوی نیسبی ، وەك : کوردی . هەولێری . بارزانی . کرمانجی ..

ج ـ ئاوڵناوی سەربەخۆ ، کەلەشوێن ناوەکە لەرستەدا بەکاربێ وەك : دز ، برسی . کوێر . نەخۆش . پزیشك . ئاسنگەر . مامۆستا . قوتابی سەپان . پاشا . میر . فەرماندە . دارکەر . سەعاتچی . پێشەوا . هەورامی ..

د ـ ئاوڵناوی راستەوخۆ :

بۆ ووشەی دووەمی ئەم نموونانە : ئەم کورە . ئەو فەرشانە ، هیچ کەس ، زۆر جار . لەگەل ئێمە . دوو پانکە .. لە نامێلکەدا رابراوە .

هـ ـ ئاوڵناوی بەیاریدە (ی) : وەکو : چاوی ماوی ۰ بەری دەست ۰۰ رابراوە لقی چڕوارەمیش من هەستم پێ کردووەو وەك نتی پێنجەم کە لە کتێبە رێزمانی‌یەکانی دیالێکێ خۆراوو ( ناودراست ) باوە زاراوەی ( ئاوڵناو )یمان بۆ داناوە جا ئەگەر ئەم زاراوە ( ئاوڵناو ) بۆ ئەو پێنج جۆرە ووشە ناو ببرێ نەك لە قوتابی ، سەر لە مامۆستاش تێك ئەدەن ئەدی باشە چار چیە ؟

بەلای منەوە باشترین چار ئەنجام دانی ئەم خالآنەیە :

ا ـ ( سیفەت ) ووشەیێکی باوە ، بەلامەوە وەختی خۆی عەرەبی نەبووەو لە ( سپی سفید ) ەوە کراوەتە عەرەبی ، تەنانەت بەهیچ گەردانێك لەقورئاندا ناوی نەهاتووە ، ووشەی پڕ بەپێستی ئەویشدان نیە ، جاکە وەکو زاراوەیێکی رێزمانی بۆ ووشەی دووەمی دەستە ووشەی نازی بەکار بێت لە بری ( ئاوڵناوی چۆنی ) گرفتە کە سووکتر ئەبێ ۰

ب ـ لە بری زاراوەی ئاوڵناو ( راستەو خۆو بەیاریدە ) زاراوەی « پاڵوو » بەکار ببرێ ، بۆ نموونە : لە : ( ئەم کورە ) دا بگوترێ : « ئەم » : راناوی نیشاندانە ، « کورە » : ناوە ، پاڵوویە ، یان لە ( قەڵەمێکی نووك باریك ) دا بووترێ : « قەڵەمێکی » : ناوە ، تەواوکەرە ، « نووك باریك » : سیفەتی لێکدراوە ، پاڵوویە ، هەروەها لە : ( شنەی شەماڵ دێ ) بگوترێ « شنە » : ناوە بکەرە ۰ « شەماڵ » ناوە ۰ پاڵوویە ۰۰ ئەوسا زاراوەی « ئاوڵناو » تایبەت ئەبێ بەسیفەتەوە ۰

« پاڵووش » شووێنی ( مضاف الیه )ی عەرەبی ئەگرێتەوە ، خواهی ناوبێ وەکو : بەری دەست ۰ پاچاوگ بێ وەکو : سەیری رۆیشتنی بکە ۰ یا جێکات ( ئاوڵفرمان ) بێ وەکو : خەوی نیوەشەو ۰ یاژمارەبێ وەکو : برای چوارەم ! یاخود سیفەت بێ وەکو : دۆی ترش ۰ کابرای نووسەر ۰ گوڵەبەرۆژەی برژاو ۰ گوێگری بەرێز ۰۰ کەچی زاراوەی ( ئاوڵناو ) بۆ

هێندیکیان نەشیازە ، بەوێنە لە : ( گرتنی کەلێنێك ) دا ووشەی ( کەلێن ) ناوڵی چاوگە ، نەك ناوڵی ناو ٠

ج ـ ئەمجا ووشەی ( جێناو ) زاراوەیکی تایبەت بێ بەو ووشانەی لەشووێن ( ناو ) دا لەرستە دا بـەبێ ناوی خاوەنەکەیان بەکاردین سـەر بەسیفەتبن یابەنیسبەت بابەهونەر ، وەك : دز ٠ کوێر ٠ کابرا ٠ جوولەکە ٠ شێت ٠ کریکار ، جوتیار ، سەعاتچی ٠ ئاشەوان ، زیڕگەر ، مەلا ٠ کوێخا ٠٠ من لە شیکردنەوەی نموونەی : ( کە چەل بـەزۆر ناچێتـە مازووان ) دا ئاسایی دەتوانم بڵێم : « کەچەڵ » جێناوە ، بکەرە ٠٠ بەلام ناتوانم بلیم : ناوە ، چونکە ناوەکەی وەکو ( کوڕ ، پیاو ، مرۆ ) فـرێ دراوە وئـەم لەشزینیەتی ، لەبەر ئەوە پێویستی بەزاراوەی ( جێناو ) بۆئـەو جـۆرە ووشانە ـ هەیە ٠

٢ ـ ئەگەر وورد بینەوە لە واتای « ئاوڵفـرمان » ، واتـای ئاوڵیـەتی واڵەگەێنی : هەمیشـە ئەو ئاوڵە لەگەڵ فرمان دا هەبێ کەچی دەیان رستە هەن ئاو ڵفرمانیان لەگەڵ دانیە ، هەروەها زاراوەی ( تەواوکەر ) بۆ ( مفعول ) بەبەری فرەوانە چونکە تەواوکەری فرمان تەنها ( بەرکار ) نیە ، هەرچی واتای گوزارەکەی پێ تەواو ببێ وەك ئاوڵفرمان گشتیان دەگرێتەوە ، بەلام بەهۆی پێ راهاتن ئەو دوو زاراوە باری تایبەتیان گرتوە وباری وورد بوونەوەکەی کزکردووە ٠

## تکایە سەیری ئەم خشتەیە بکە

| زاراوەی یەکەم | زاراوەی دووەم ( ئەرکی ووشەکە لەرستەدا ) : نیهاد ( بکەر ، دارا ) | پاڵوو ( مصاف الیە ) | گوزارە |
| --- | --- | --- | --- |
| ناو | کچەکە هات<br>شەو زوویە | بەرد ی کەچ<br>شەوی درێژ | ئەمە کەچە<br>کات شەوە |
| جێناو ( صفة ) | جوتیارە کەهات<br>جوتیار بەسوودە | پیاوی جوتیار<br>ماندوو نەبێ | ئەمە جوتیارە<br>ئەوانە جوتیارن<br>تۆ هاتی |
| راناوی کەسی ( لکاو ) | ( راناوی سەربەخۆ وەکو ناو وایە ) :<br>هەڵت هێنا | کەسێکت نبێرە | —— |
| راناوی نیشاندان ژمارە | ئەوانە چ دەکەن<br>ئەودت راستە<br>سێیان هاتن<br>سێیان باش نین | ئەو کورە دەرچووە<br>ئەو دارانە کورتن<br>لەپۆلی سێیەم<br>دەخوێنێ | تۆ ئەوی<br>ئێوە ئەوان نین<br>ئەوانە سێن<br>دووجار یەک و<br>نیو سێیە |
| چاوگ | زانین هۆش زیاد<br>ئەکاو زانین بە<br>هەوڵدانە | کاتی نوستن<br>قەمەکە<br>زرووی خەو تنت خۆشا | ئەم ژوورە بۆ<br>دانیشتنە |
| فرمان | ——<br>—— | ——<br>—— | رۆیشت<br>دانیشت<br>سەیری کرد |
| ئاوەڵکار | براوە باکی نیە<br>دۆراوە پاردکە<br>نەدات | دەنگی بانگدەری<br>مزگەوتەکە خۆشە<br>( خۆشێ بوو ) | باوکم نووسەرە<br>کاکت پارێزەر<br>بوو |
| ناوی کراو | هۆنراوە کەت<br>پەسند بوو ،<br>یان : پەسندە | کڵاوێکی<br>چنراوم بۆ<br>بکرە | تەکانت<br>هەڵگەراوەن<br>( هەڵگەڕاوە )<br>بوون |

| تەواوکەر | ئاولفرمانیچۆنی | ئاولفرمانی کاتی |
| --- | --- | --- |
| گەچەکە بهێنە | بەرد بەرد لایانبە | بەبانی دێتەوە |
| بۆ گەچ چووە | پۆل پۆل ریزیان بکە | لەکن ئاسنگەرە کەبو |
| کشت بەجوتیار | بەفیز ێکەوە | —— |
| دەکرێ | دانیشتبوو | —— |
| برای تۆ | ئەوە تۆێت .. | |
| دەت نێرم ، | —— | —— |
| نات ناسمەوە | —— | —— |
| هەڵت نافریوێنم | | |
| ئەودم ناوێ | —— | —— |
| بەئەوە ناکرێ | —— | —— |
| بەسێیانیان | بۆلێزوە کان سێ | —— |
| بنێرە بەسێ | سێ ئەخاتە دەمیەوە | —— |
| کەس ناکرێ | | |
| بەهول دان | —— | —— |
| دەردەچێت | —— | —— |
| تێبگە : ددلیمچی | —— | —— |
| برۆ : بخەوە | —— | —— |
| نوسەرە کەم دێت | —— | —— |
| مافی چاپ کرد نی | —— | —— |
| بۆ نوسەریەتی | | |
| هەڵگەراوەکان | —— | —— |
| مەهێنە . | —— | —— |
| چاپ کراوێکتم | | |
| بۆ نێرە | | |

ئـەو نامیلکانەی سەیریان کراوە :


١ ـ ریزمانی کوردی ـ ناو ـ د٠ عبدالرحمن حاجی معروف ٠

٢ ـ ریزمانی کوردی قۆناغەکان ـ لیژنەی ریزمان / پەروەردە ٠

٣ ـ وانا ناسی ( رەوانبیژی ) عەزیز گەردی ٠

٤ ـ رەوانبیژی بەشی واتاناسی ـ نووسەر ( دەستنوس ) ٠

٥ ـ فەرهەنگی خاڵ ـ بۆ چاوگەکان کەلکی باشی بووە ٠

٦ ـ ریزمانی کوردی بەکوردی وەبەعەرەبی = احمد حسن ٠

٧ ـ ئامرازی سینتاکسی ـ ع ٠ ابراهیم عزیز ٠

٨ ـ ئاوا ودستورا زمانی کردی ـ جگەر خوین ٠

٩ ـ کیشەیێک لەریزمانی کوردیدا ـ رۆف ئالانی ٠

١٠ ـ ریزمانی کوردی بەکەرستەی کرمانجی سەرو وخوارو ـ قەناتی کوردو ـ وەرگیرانی لەروسییەوە : د٠ موکریانی ٠

١١ ـ رستەی دووا کەوتووی رستەی پێشکەوتن خواز ٠ ع ٠ ابراهیم عزیز ٠

١٢ ـ ریزمانی کوردی ٠ نوری علی امین نووسراوەکانی ئەو نوری یە گرنگترین سەرچاوەی ریزمانی بوون بۆهەموو نامیلکەکان ٠٠


ـ کۆتـایی ـ


رقم الایداع ١٠٤٥ في المكتبة الوطنية ببغداد لسنة ١٩٨٥

